

زنجـيرەی کتـێبی دەزگـای چـاپ و پەخـشی سەردەم
کتێبی گیرفانی ژمارە (٥٢)
سەرپەرشتیاری گشتیی زنجیرە
ئازاد بەرزنجی

بوونگەرایی فەلسەفەی مرۆڤایەتییە

نووسینی: جان پۆڵ سارتەر
وەرگێڕانی : رۆشنا ئەحمەد رەسوڵ

بابەت: فەلسەفی
بەڕێوەبەری هونەری: شیروان تۆفیق
مۆنتاژی کۆمپیوتەری: سەیران عەبدولرەحمان
هەڵەچن: نیشتمان محمەد فازل
ژمارەی سپاردن : ١١١ ی ٢٠٠٤



* بوونگەرایی/ بە مانای -الوجودیە- دێت و دەتوانرێت بوونخوازیی یان هەبوونایەتی یان بوونایەتی-یش بەکاربهێنرێت، ئێمە وەک وەرگێڕی کوردی و بژارکەری پێداچوونەوە -بوونگەرایی- مان پێشنیارکرد ئیدی ئێوەش سەرپشک بن لە سەقامگیرکردن و جێگیرکردنی چەمکەکە لەم دەقە وەرگێڕدراوەدا..

(ڕۆشنا، حەمە)

سەرەتا:

سارتەر زۆربەی چەمک و مانا گەورەکانی، واتا سەرەکییەکانی بوونگەرایی لە (هایدگەر)ەوە وەرگرت، بەلام بە شێوەیەکی هێند نایاب و نوێ بیرۆکەکانی دارشتەوە، کە بووە جێگەی سەرنج و پێشوازی لێکردنی زۆربەی خەڵکی، چونکە نووسینەکانی هایدگەر بە هۆی ئاڵۆزیی زمانەکەیو قوڵیی بیرۆکەکانیەوە، تێگەیشتنیان بەلای خەڵکییەوە، تەنانەت بەلایەن پسپۆڕانەوە گران و سەخت بوو. دوای ئەو باشتر شیکردنەوانەش، سارتەر چەندین ڕاوبۆچوونی بێوێنەی خۆی خستەڕوو، کە بە هۆیەوە ڕەسەنێتی خۆی وەک فەیلەسوف و وەک نووسەر تۆمار کرد. هەرچی لێزانی و ئازایەتی سارتەرە، کەوتۆتە نێو پڕکردنەوە و تەواوکردنی بیری بوونگەرایی، چ وەک ڕێبازێک یان وەک فەلسەفەیەک،



که هەردەم لە ژیاندایە و بە زیندوویتی لە ناخی ویژدانی فەلسەفیدا دەمینێتەوە، چونکە بوونگەرایی بەر لە هەرشتێک فەلسەفەی مرۆڤە. لەبەرئەوە مرۆڤ کرۆک و گەوهەری مەسەلە و تۆژینەوەی بوونگەراییە، بگرە تاکە بابەتی تۆژینەوەی بوونگەرایی، مرۆڤە. بەڵام کام مرۆڤ و چ بوونێک؟ لە وەڵامی ئەمجۆرە پرسیارانەوە، سارتەر پرەنسیپە سەرەکییەکانی خۆی لە بوونگەراییدا دادەنێت؛

بوون پێش بنەرت/ چییەتی کەوتووە، مرۆڤ لە یەکەمین بوونی خۆیدا و هەر لە سەرەتای لەدایکبوونیەوە هیچ شتێک نییە و ناکرێت بیدۆزینەوە، لەبەرئەوەش؛ سروشتی مرۆیی بوونی نییە، دواتر لە جیهاندا هەڵدەقوڵێت، فرێدەدرێتە جیهانەوە، بە خەسڵەتێک کە دیاری نەکراوە دێتە بوون، ئەگەرچی بوونێک کە ڕاستییەکی ڕێکەوتییە، پاشان؛ دەرک بە خۆی دەکات و وێنای خۆی دەکات، چونکە مرۆڤ بە پێچەوانەی شت و بابەتە مادییەکان، دەتوانێت وێنای خۆی بکات و وێنای داهاتووەکەشی بکات، یان مرۆڤ دەتوانێت چارەنووسی خۆی دەستنیشان بکات.

بەو پێیەش کە دەرک بە خۆی دەکات و هەست بەوە دەکات و دەچێتە داهاتووەوە، دەجووڵێت، کاردەکات، مرۆڤ لە ڕێگەی کار و کردەوەکانیەوە بەهای خۆی پێکدەهێنێت، کەواتە پێش هەموو شتێک؛ مرۆڤ پرۆژەیە و هیچ شتێک بەر

لەم پڕۆژەیە بوونی نییە، بەڵکو مرۆڤ خۆی وێنای ئەو پڕۆژەیەش دەکات و دواتر ئافەریدەی دەکات، هەر بە گوێرەی ئەو وێناکردنەش؛ چۆنیەتی پڕۆژەکە و چۆنیەتی داهاتووەکە بەدەردەکەوێت و، پڕۆژە و داهاتووەکەی خۆی دەهێنێتەدی. هەرچەندە؛ مرۆڤ ئەو پڕۆژە بەردەوامەیە کە هەرگیز ناتوانێت خودی خۆی بە تەواوی بهێنێتەدی. کەواتە مرۆڤ لەگەڵ خولقاندنی بوونی خۆیدا هەروەها بوونی خۆشی هەڵدەبژێرێت، لەگەڵ ئەو هەڵبژاردنەشدا کەسانی دیکەش هەڵدەبژێرێت. کەوابێت، بەهای کەسانی دیکەش، چییەتی کەسانی دیکەش دروستدەکات، ئەوانەش هەرچۆنێک بن و هەر شێوەیەکیان هەبێت، ئەوا؛ مرۆڤ خۆی بەرپرسیارە بەرامبەری، بەو مانایەی هەموو مرۆڤێک بە پێویست بەرپرسیارێتی تەواوی بوونی خۆی هەڵدەگرێت. هەر بۆیە بوونگەرایی بەرپرسیارێتی هەموو بوونی مرۆڤ دەخاتە سەرشانی مرۆڤ خۆی.

کاتێک مرۆڤ لەتەک خۆیدا کەسانی دیکەش هەڵدەبژێرێت، ئەوا لەتەک بەرپرسیارێتی بوونی خۆیدا، بەرامبەر خەڵکانی دیکەش لێپرسراوە، واتە بەرپرسیارێتییەکەی بەرەو هەموو مرۆڤایەتی درێژ دەبێتەوە. کاتێک بۆ خۆی بڕیارێک دەدات، ئەوا بڕیارەکەی هەموو مرۆڤێک دەگرێتەوە، یانی مرۆڤ دەتوانێت لە ناوەوەی خۆیدا، کۆمەڵگە –ئەوانی دیکەش



بگۆڕێت، ئەگەر ئاوهابێت؛ باشتر وایە مرۆڤ هوشیارانە وێنابکات و بڕیار بدات، تاوەکو بەهۆی بڕیاری هوشیارانەوە، بەسەر تەگەرە و گرفتەکاندا زاڵ بێت. هەرچەندە ئەمە وادەکات ئەرکی سەرشانی مرۆڤ گرانتر بێت، بەرپرسیارێتییەکەی لەوە گەورەتر بێت کە پێشتر وێنای کردوە، بڕیارەکەی، بەرپرسیارێتییەکەی تەنیا بۆ خۆی –وەک تاک– نییە، بەڵکو هەموو مرۆڤایەتی دەگرێتەوە. ئەم لێپرسراوێتییە مەزنەشە کە پەشێویی و نیگەرانی لە دەروونی مرۆڤدا دەخوڵقێنێت، هەرچەندێک هەوڵ بدات لەو نیگەرانییە ڕابکات، یان حەشاری بدات، بەڵام شاردنەوە و ڕاکردنەکەشی ناتوانن ئەو ڕاستییە گەورە و زەقە لەنێوبەرن کە؛ پابەندبوونی مرۆڤ، پابەندبوونێکی گشتی/ هەمەکییە، هەروەها ئەو تاکە یاسایەی لە سەروو مرۆڤەوەیە و، بەهای مرۆڤ چێنادەکات؛ یاسای ناوەوەی مرۆڤ خۆیەتی.

تاقە شتێک کە مرۆڤ لە شت و بابەتە مادییەکان جوێ دەکاتەوە، ئازادییە، ئەو ئازادییەی مرۆڤ هەیەتی، مرۆڤ بە ئازادی فڕێدراوەتە جیهانەوە، بە ئازادی خوڵقا و هاتەبوون/ ئافەریدەکرا، ئازادانە وێنادەکات و خۆی هەڵدەبژێرێت، کەوابێت؛ پێویستە مرۆڤ ئازادبێت، چونکە مرۆڤ خۆی ئازادییە و، هیچ شتێکیش ناتوانێت ئازادی سنووردار بکات،



بەم پێیە ئازادی واتای ئەوەیە خود دوور لە کۆت و سنوورە دەرەکی و یاسا بابەتییەکان، خۆی دەسەلمێنێت.

هەموومان بە ئازادییەوە خۆمان ئافەریدە دەکەین, بۆیە هەموو لەگەڵ ئازادیداین. وەلی؛ مرۆڤ چەند ئازادبێت، هێندەش بەرامبەر کار و کردەوەکانی خۆیو بەرامبەر سەرجەم مرۆڤایەتی بەرپرسیارە. لەبەر ئەم هۆکارە، شتێکی سەیر نییە بوونگەرایی (کار) پیرۆز دەکات و، دەیکاتە پرەنسیپی سەرەکی خۆی. لای بوونگەرایان؛ هیچ ڕاستییەکی واقیعی نییە تەنیا لە کاردا نەبێت و، مرۆڤ هیچ شتێک نییە، لە کۆی کارەکانی خۆی زیاتر. کەواتە ئەم جیهانە هەرچۆنێک بێت و ژیان و گوزەرانی مرۆڤ هەر شێوەیەکی هەبێت، ئەوا دەستکردی مرۆڤ خۆیەتی، لەبەرئەوەی؛ مرۆڤ خۆی بڕیار دەدات ئەو خۆی چییە و خەڵکانی دیش چین و چی و چۆن دەبن.

ئەم کتێبە بچووکەی سارتەر، زیاتر لە وەڵامدانەوەی ڕەخنەکان و بەرگریکردن لە بوونگەرایی نزیکترە، وەک لەوەی شیکردنەوەیەکی دیاریکراو بێت، یان خستنەڕووی بیرۆکە قووڵەکانی بێت، لەگەڵ ئەوەشدا و لەتەک وەڵامدانەوەی ئەو ڕەخنانەدا، کە ئاراستەی بوونگەرایی کراون، سارتەر بە پێی پێویست، کورتەی هەندێک لە پرەنسیپە سەرەکییەکانی خۆیشی خستۆتە ڕوو. لە هەموو



نووســـــینێکیدا، ســــارتەر وەک فەیلەســــووفێکی دڵـــسۆز و نووسەرێکی پابەند، ڕاستگۆیانە بانگەشەی بۆ گۆڕینی جیهان و دامەزراندنی ئازادی و دادپەروەری کردووە، دڵـسۆزانەش هەوڵیداو بەرپرســیارێتی و ئــازادی و بــوونی مــرۆڤ بخاتــە بەردەم مـرۆڤ و ڕاشـکاوانە بـڵێت: بوونگـەرایی فەلـسەفەی مرۆڤایەتییە.

ڕۆشنا ئەحمەد

٢٠٠٣

پێشەکی وەرگێڕی عەرەبی..

بوونگەرایی، مەیل و ئارەزوویەکی فەلسەفی نوێ نییە، هەروک چۆن خەڵکانێکی زۆر وای بۆ دەچن، بەڵکو؛ شێوەیەکە کە لەنێو جەرگەی ویژدانی فەلسەفییەوە سەرچاوەی گرتووە.. هەر لەو کاتەوەی کە مرۆڤ هەستی بە ئازادی خۆی کردووە و دەرکی بەوە کردووە؛ کە ئەو بوونەوەرێکی وەها بێوێنەیە لەم گۆی زەمینەدا.

پێدەچێت فەلسەفە، بە کۆی هەموو ڕێبازەکانیەوە، فەلسەفەی ئەو وێناکردن و بیرۆکانە بێت کە ئەقڵ و ئاوەز لە تێگەیشتنی جیهان و باڵکێشان بەسەریدا، ڕۆڵی یەکەمین ببینێت، گەرچی ڕێڕەوێک بەو ئاقارەدا بێت، وا دەکات تاکێتی مرۆڤ **singularit'e** – – یان (**single**) لەو بۆتەیەدا بتوێنرێتەوە کە هەست و دەرکپێکردنمان لەسەر ئەو بیرۆکە بە بەستەڵەک بووانە دابمەزرێنێت کە واقیعی مرۆڤایەتی ڕاست و دروستمان لێدەشێوێنێت.

لەبەرئەوە، ئەو هەوڵە بەردەوامانە دەبینین کە دەگەڕێنەوە لای مرۆڤ و بوونە بەرچاوییەکەی مرۆڤ دەپشکنن، کە هەموو ناکۆکی و کێشمەکێشێک لەخۆدەگرێت، بە ئامانجەکان و نۆرم و بەهاکانیەوە. بوونگەراییش بە هەموو شێواز و ئاراستەکانیەوە؛ بریتییە لە فەلسەفەی مرۆڤ و بەدەوری کەسێتی ئەودا چەقدەگرێت و دەیکاتە ئامانجێک بۆ هەموو



بایەخ و گرنگـی پێـدانێکی، نـەک تـەنیا بەوپێیـەی کـە مـرۆڤ بوونەوەرێکی تاکە و تۆوی ئـازادی تێدایـە، بەڵـکو هـەروەها بەوپێیـــەی مـــرۆڤ ڕۆچۆتـــە نێـــو کۆمەڵـــگای مرۆڤـــایەتی بەرفراوانەوە، کە ئەویش بواری ژیانە ئازادەکەیەتی و مـەودا دیاریکراوەکەیەتی.

مـەیلی بوونگـەرایی، هـەر لـەو کاتـەوە وەدەرکـەوت کـە کیرکێگـارد –**Kierkegeaard**- شۆڕشـــی بەســـەر هـیگڵ – **Hegel**-دا بـەرپاکرد و دژ بـە وشـکێتی ئەقـڵی بـڵندگەرایی دەربـارەی ژیـان وەسـتایەوە، کـە لـە کۆتاییـدا دەیگەیەنێتـە نکوڵیکردن لە واقیعـی زینـدووی مـرۆڤ. کیرکێگـارد بـەردی بناغەی بوونگـەرایی ئایینییـە و چەنـدین فەیلەسـوفی دیکـەی لێوە سەرهەڵدەدەن، وەک: کارل یاسپرز **Karl Jaspers**–– و گابرێل مارسـیل **Gabriel Marcel**–– و چەنـدین کەسـی دیکەش لەوانەی ئایینی مەسـیحییان بـە ڕێچکـەی فەلـسەفیدا بەرێکرد، نوێیە؛ بە دۆز و کێشە و بابەتەکانیـەوە و، کۆنیـشە؛ لـــەوەدا کـــە ڕەگوڕیـــشەی لـــە قـــووڵایی ڕۆحـــدا داکوتیـــوە، تەکانێکی ڕۆحییە و مانای مرۆڤی گـۆڕی و ئازادیـشی کـردە هەوێنی بوونەکەی.

نیتچــە – **Nietzsche**، بــە ســیما جەربەزەکەیــەوە وەکــو پێـــشەنگێک بـــۆ مـــەیل و ئـــارەزووی بوونگـــەرایی نائـــایینی ڕادەوەستێت، شۆڕش بەسەر هەموو بەها مرۆییەکاندا بـەرپا



دەكات و ناڵەی هاوارەكەی ڕەوانە دەكات: (خودا بزر بـوو!)، ئەم هاوارە زۆربەی ئەقڵە والاكـانی مەسـت كـرد و ڕووە و ڕێگـە ڕووناكـەكان پاڵـی پێوەنـان، پێـی وابـوو كـە ڕێگـا ڕاستەكانی ژیانە. زۆر كەسیش ئەوەیان لـە یـادچووبوو كـە ڕوونـاكی چەنـدین چاوگـەی هەیـە، هەربۆیەشـە ویـژدانی ئەوروپی لە ڕەگەكانیەوە هەڵكێشرا و بە سەرخۆی و ژیانیـدا سـەرچڵ و یـاخی وەسـتایەوە و ڕایدەگەیـەنێت: كـە خـۆی خودانی ڕەهای چارەنووسی خۆیەتی و تاكـە یاسـادانەرێكی نۆرم و بەهاكانیەتی. ئەو شۆڕشە و ئەو ڕێبـازە، زۆری لـەو كەسانە بەرهـەمهێنا، كـە دواتـر مێـژووی شارسـتانی بـڕیار لەسەریان دەدات.

لـە نیتچـەوە، چەنـدەها كەسـایەتی لـق و پۆپیـان لێبـۆوە، ئەوەی ئێستا بەلامانەوە گرنگـە؛ (هایدگـەر- **Heidegger**)ی فەیلەسوفی ئەڵمانی هاوچەرخە. كە جان پۆل سارتەر، لەسەر دەستی ئەو خوێندویەتی.

هایدگەر دەڵێت: بوون لە هیچەوە (یـاخود لـە عەدەمـەوە) هەڵدەقوڵـێت و مـرۆڤ لـە خـودی خۆیـدا بوونەوەرێكـە و فڕێدراوەتە جیهانەوە، هیچ شـتێكیش لـە چارەنووسـی ئـەودا هێندەی مەرگ (یان مردن) ئاشكرا و دڵـنیا نییـە. مـرۆڤ ئـەو بوونەوەرەیە كە ژیانی تێكەڵ و لكاوە بە هـیچ و عەدەمـەوە، عەدەمێك تەفسیر ناكرێت، بزر و ونی نێو هـیچ و عـەدەمێكی

دیکـەش دەبێـت کـە شـیناکرێتەوە و شـیکردنەوەی لـەوەی یەکەمیان سەختترە. لەم کەشە نوتەکەدا فەلسـەفەی سـارتەر پێکهات، کە لە (دیاردە- **Phenomena**- وەک بناغەیـەک بـۆ بوون) زیاتر بڕوای بە چیدیکە نییە ( دیاردە، وەک بناغەیـەک بۆ بوون)، ئەوەی سارتەر پێی دەڵێت: ئـەنتۆلۆژیای دیـاردە- **Ontologie phenomenologi**، ئەمـــەش ناونیـــشانی دووەمی کتێبەکەی (بوون و نەبوون (یان هەبوون و عەدەم)- **Being and Nothingnees**)ە. ئـەم کتێبـەی دوایـشیان، هەوڵـێکی گەورەیـە بـۆ چڕکردنـەوەی سـەرنجدان لـە سـەر بوونگەرایی بێباوەڕیی، کە لەسەر بنەڕەتێک دامەزراوە، هێنـد لە شێواز و مـۆدێلی کلاسـیکی لـە بیرکردنـەوەدا دوور نییـە، تەنانەت دەبینین سـارتەر لـە بەشـی کۆتـایی کتێبەکەیـدا، بـە شێوەیەکی نائاگایی دژایەتی لەگەڵ خودی خۆیدا دەکات.

بەڵام سارتەر ڕوویەکی میللـی تایبـەتی هەیـە، کەسـایەتی خـــۆی وەک فەیلەســـوفێک وێنـــاکردووە، کـــە ئـــەوەش وایلێکردووە، وێنەیەکی پوختی بوونگەرایی بێت، وەک بـڵێیت لـە ئـەودا نـەبێت، نانوێنرێت. چەنـدین ڕێبـازی کۆمەڵایـەتی ئاست نزم سەریان هەڵدا و خۆیان خستە پاڵ بوونگەراییـەوە و شەپۆلەکانیان بۆ سارتەر دەگەڕاندەوە، لەگـەڵ ئـەوەدا کـە سارتەر لەو هەرا داهێنراوانەوە دوور بوو کە کەوتبوونە نێـو هەندێک لە یانەکانی پاریسەوە، بۆ ماوەیەک کە کورت نەبوو،

ئەو هەرایە جۆرێک لە (تا)ی کۆمەڵیی پێکهێنا کە وەخت بوو بە تەواوی ئاکاری گەنجەکان وێران بکات، ئەو ڕەشەبایە تا ئێستاش بە شێوەیەکی جیدی هەڕەشەیان لێدەکات.

ئەم کتێبە، کە ئەمڕۆ پێشکەشی خوێنەری دەکەین، هەوڵێکی دڵسۆزانەی جیدییە بۆ ڕوونکردنەوەی بوونگەرایی، بێگومان هەروەک سارتەر لێی تێدەگات، لەسەر ئاستێک کە بە پێی توانا ساناکراوەتەوە. سارتەریش فەیلەسوفێکی ڕەسەنە، بیروڕاکانی خۆی بە ڕاشکاوی و دڵسۆزییەوە دەخاتەڕوو، ڕاستیەک دەدۆزێتەوە و ڕایدەگەیەنێت کە بە ئەقڵی خۆی دەبینێت و دواجار بڕوای پێدەکات.

لەم نامیلکەیەدا، سارتەر هەوڵ دەدات پەیوەندی فەلسەفەکەی، بوونگەرایی بە مەیل و ئارەزووی (ڕەوتی) مرۆیی- هیومانیزم- بەیان بکات، مەیلی هیومانیزمیش- **Humanism**، دەربڕینێکی فەلسەفی ژیارییە، کە مەبەست لە کۆمەڵێک بیروڕا و ڕێباز و بەهاو نۆرمێکن کە تیۆرییەک پێکدەهێنن، کە بتوانێت بە ئامرازە تایبەتییەکانیەوە قوتار بوون و فەریادڕەسی مرۆڤ دەستەبەر بکات[1].

ئێستاش کە بوونگەرایی، بە جۆرە جیاوازەکانیەوە، بۆتە ڕێبازێکی سەرەکی لە شارستانیەتی ئەورووپیدا، ئیدی پێویستە هاولاتی ڕۆژهەلاتیش ڕاستەوخۆ بیخاتە ژێر باسەوە، بە گەڕانەوەی بۆ دەقەکان، هەروەها لەمەڕ ڕێبازە



جیاجیاکانیـــشەوە زانــین و ئاگـــایی و خــۆی ڕابگەیــەنێت و ڕاوبۆچوونە ناکۆکەکانیش هەڵاوێرد بکـات. لەبەرئـەوە ئێمـە وەڵامێکی مارکسی بۆ ئەم کتێبە و هەروەها وەڵامێکی دیکەی مەسیحیش دەخەینە بەردەمی خوێنــەران، یەکـەمیان وەڵامـی (جان کانابا- **Jean Kanapa**)یە بە ناونیشانی (بوونگـەرایی فەلسەفەیەکی مرۆڤخوازانە نییـە) و دووەمیـان کتـێبی (لـوک لوفیڤەر(- **Luc Lefevre**)ە بە ناونیشانی (ئایـا بوونگـەرایی فەلسەفەیە یان نا؟).



دەستپێک

ئەو ڕەخنانەی ئاراستەی بوونگەرایی کراونەتەوە

دەمەوێت لێرەدا بەرگری لە بوونگەرایی بکەم، دژ بە هەندێک لەو ڕەخنانەی ئاراستەی کراونەتەوە، ئەوان، بۆ نموونە؛ بەوە تاوانباری دەکەن، کە بانگهێشتی خەڵکی دەکات لە بێهیواییەکی کپ و کاسدا بمێننەوە، چونکە هەموو چارەسەرەکان مەحاڵن و، کارکردنیش لەم جیهانەدا هەر مەحاڵە. هەروەها بەوە تۆمەتباری دەکەن کە دەبێتە هۆی فەلسەفەی ڕامانکاری (تاملیە)، کە لە ڕووکەشی ڕۆحێکی بۆرژوازی زیاتر چیدیکە نییە، لەبەرئەوەی تێڕامان زێدەڕۆییە، هەر ئەمەش بڕوای کۆمۆنیستەکانە بە شێوەیەکی تایبەتی.

ڕەخنەی مارکسییەکان..

لە لایەکی دیکەوە، ئەوە دەخەنە پاڵمان، کە ئێمە جەخت لە ڕیسوایی مرۆڤ دەکەین و، لە هەموو شوێنێکدا ئەوەی پیس و دوودڵی و قێزەوەنە دەیخەینە ڕوو، بەمەش، ئێمە بە بڕوای ئەوان لایەنی ڕووناک لە لایەنە جوان و بێگەرد و بێخەوشەکانی سروشتی مرۆڤ پشتگوێ دەخەین (بۆ نموونە: وەک ئەوەی زەردەخەنەی منداڵێکی بێگەردمان



بیربچێتەوە، کە ئەمەش ڕای خاتوو (مرسییە)ی کاسۆلیکییە).
ئیدی لێرەولەوێ بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئێمە لە هاوکاریی مرۆیی دوورکەوتووینەوە و لە جیهانمان دابڕیوە و لەنێو تاکێتی خۆیدا گەمارۆمان داوە، ئەوەش لەبەرئەوەی ئێمە، هەروەک مارکسییەکان دەڵێن: لە خودگەرایی پەتی (ڕەها)وە دەستپێدەکەین، واتە لە کۆژیتۆی[2] دیکارتەوە، یاخود بە مانایەکی دی؛ ئێمە لەو چرکەساتەوە دەستپێدەکەین کە مرۆڤ لە دابڕینی خۆیدا دەرک بە خودی خۆی بکات، ئەمەش ئێمەی بە چەشنێک لە دیدی ئەواندا لاواز کردووە، کە توانای گەڕانەوەمان نەبێتەوە بۆ ئەو جیهانەی تیایدا هاوکاربین لەگەڵ سەراپای خەڵکی کە لە دەرەوەی منن (**Lemoi** یان **Ego**) و ناتوانین لە کۆژیتۆدا باسیان بکەین.

ڕەخنەکانی کاسۆلیک..

بە لایەنی مەسیحییەکانەوە، بەوە تاوانبارمان دەکەن، کە ئێمە نکولی لە واقیعییەتی کردە مرۆییەکان و سوودەکانیان دەکەین، چونکە ئێمە ئامۆژگاری و بەهاکانی خودا لادەبەین، ئەو بەهایانەی لە هەتایی و نەمریدا کێشراون، بەوەش هەڕەمەکێتی ڕەها بەرکەماڵ دەبێت و مرۆڤخوازیاری چ بێت دەیکات و ناتوانێت حوکمڕانی ڕاوبۆچوونەکانی کەسانی دیکە و کردەوەکانیان بێت.

ئێستا هەوڵ دەدەین وەڵامی ئەو تۆمەتبارکردنە جۆراوجۆرانە بدەینەوە، هەر لەبەرئەوەش ناونیشانی ئەم تۆژینەوەیەمان کردووە بە (بوونگەرایی ڕەوتێکی (مەیلێکی) مرۆییە)، خۆ ئەگەر باسەکەمان دەربارەی بوونگەرایی وەک مەیلێکی مرۆیی، هەندێک کەسی سەرسام کرد، ئەوا چۆنیەتی تێگەیشتنمان لەم مانایەش ڕوون دەکەینەوە، ئەوەی لە سەرەتادا دەتوانین بیڵێین، ئەوەیە؛ ئێمە وەک تێڕوانینێک لە فەلسەفەی بوونگەرایی دەگەین، کەوا دەکات ژیانی مرۆڤ شیاو بێت و ڕاییگەیەنێت کە؛ هەموو ڕاستییەک و هەموو کردەوەیەک، پێویستیان بە ژینگەیەکی دیاریکراو و خودگەرایی مرۆیی هەیە.

بوونگەرایی و ڕەشبینی..

ئەو تاوانە سەرەکییەی ئاراستەمان دەکرێت، ئەوەیە؛ ئێمە بە تەنها باس لە لایەنی خراپی ژیانی مرۆڤ دەکەین، تەنانەت لەم دواییەدا باسی ژنێکیان بۆ کردم، کە هەر کاتێک ڕەفتارێکی نابەجێ بنوێنێت، داوای لێبوردن لە بەرامبەرەکەی دەکات و دەڵێت: "لێم ببورە، وابزانم من وەک بوونگەراییەکان ڕەفتار دەنوێنم!"، وەک ئەوەی بوونگەرایی و ناشرینی یەک شت بن!

بوونگەرایی سروشتی و مەیلی ناتورالیزم



(یان: ڕەوتی ناتوراليزم)

بـــــەمجۆرە مـــــەيلی سروشـــــتخوازی (نـــــاتوراليزم- **Naturalism**) توند و ڕەقيان خستۆتە پاڵـمان، خـۆ ئەگـەر ئێمە بەو شێوەيە بووينايە، ئەوا شتێكی زۆر سەيرە كە ئەمڕۆ لــە خــودی سروشــتخوازی تۆقێنــەرتر و ئابــڕووچووتر لــە قەڵــەممان دەدەن. ئــەو كەســـەی (بــۆ نموونـــە) بەرگــەی خوێندنـــەوەی چيرۆكــی (زەوی)ی ئــەميل زۆلا **E. zola–** دەگرێــت، دەبيـــنين لـــە كـــاتی خوێندنـــەوەی چيرۆكێكـــی بوونگەرايیدا تووشی شۆك و تاسان دەبێت. ئەوەش كە وتـە و پەنــدە غەمگينــەكانی ميللــەتان بــەكاردەبات، لــە ئێمــەدا دەربڕينێكی بە ئێش و ئازاری ئەوتۆ دەبينێتەوە، كـە دڵـتەنگی و خەمۆكی زياتر مانای هەڵگرتبێت.

پەندی ميللەتان..

داخۆ بەڕاست شتێك لەو وتەيە زياتر هەيە، كە بانگهێـشتی كۆڵدان و بێهيوايی دەكات..! بۆ نموونە لەسەر زمانی پەنـدی ميللەتان كە دەڵێت: "خۆشـەويستی ڕاست ئەوەيـە مـرۆڤ لـە خۆشويستنی خودی خۆيەوە دەستپێبكات"، يان ئـەم وتەيـە: "ئەگەر لەگەڵ خراپدا بێبـاك بوويـت، ئـەوا گاڵـتەت پێـدەكات، ئەگەر لەگەڵيشيدا توندوتيژ بوويت، ئەوا ڕێـزت لێـدەگرێت". ئێمە منەتباری ئەو هەموو بير و بۆچوونانە نين كە ئێـستا لـە

گۆڕێدان و هەموویان یەک شتی نێگەتیڤ دەڵێن؛ "تێمەکۆشن دژ بەو دەسەڵاتەی لە ئارادایە و، بەرگری لە هێز مەکەن و، هەوڵ بۆ باشترکردنی بارودۆخە مرۆییەکەت.. کۆمەڵایەتیەکەت مەدە..ن، هەرکارێک لەگەڵ خوونەریتدا نەگونجێت، ئەوا کارێکی ڕۆمانسییە، هەر هەوڵدانێکیش پشت بە ئەزموونی تاقیکراوەوە نەبەستێت، لە ئاکامدا نوشوستی و نسکۆ دێنێت، بەڵکو هەمان ئەزموون دەریدەخات، کە خەڵکی هەمیشە بەرەو هەڵدێر دەخلیسکێت، خۆ ئەگەر بە شتە پتەو و جێگیرەکانەوە نەیانبەستینەوە، ئەوا دەبووە ئاژاوە و جەنجاڵی".

ئەو کەسانەی هەموو کردەیەکی نەشاز دەکەنە بیانوو بۆ لاوازیی مرۆڤ و بە هۆنراوەی واقیعی هەستکارەوە گۆرانی دەچڕن، ئەو کەسانەن کە بوونگەرایی بە (تاریک) تاوانبار دەکەن. ئایا بوونگەرایی بە نیسبەت ڕەشبینی ئەوانەوە، ڕوونبین نییە؟ لەبەرئەوەی بوونگەرایی ڕێگە بۆ بواری هەڵبژاردن لەبەردەم مرۆڤدا خۆشدەکات.

بۆ وەڵامدانەوەی هەموو ئەو شتانەی لە ڕەخنەکاندا هاتووە، دەبێت لە ئاستی فەلسەفی ڕووتەوە بڕوانینە مەسەلەکە و بپرسین: بوونگەرایی چییە؟

## بوونگەرایی چییە؟



نوخشەی (البدعە)[3] بوونگەرایی..

ئەو کەسانەی ئەمڕۆ وشەی (بوونگەرایی) بەکاردەهێنن، هەروا بە ئاسانی ناتوانن پاساوێک بۆ بەکارهێنانی ئەو وشەیە بهێننەوە، بە ڕادەیەک ئەم وشەیە بڵاوبۆتەوە، کە دەڵێن: ئەو مۆسیقاژەنە یان ئەو وێنەکێشە، یان ئەو ڕۆژنامەنووسە بوونگەرایە، ماناکەش بە هۆی فراوانییەکەیەوە بزربووە. هەردەڵێی ئەو خەڵکەی زۆر بە تاسەوەن بۆ هەرایەکی بەدناو، لەنێو بزوتنەوەیەکی وەک سوریالیزمدا **Surrealism**- نایدۆزنەوە، دەبینین کتوپڕ خۆیان بە فەلسەفەی بوونگەراییەوە دەبەستنەوە، لەگەڵ ئەوەی بوونگەرایی ناتوانێت لەم بارەیەوە شتێکی ئەوتۆیان پێبلێت. بوونگەرایی تیۆرییەکە، کەمتر ناو زڕاوە و دلڕەقترە، تەنیا ڕوو لە فەیلەسوفان و پسپۆڕەکانی کاروباری بیر و فیکر دەکات، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا پێناسەکردنی گەلێک ئاسانە.

دوو جۆر لە بوونگەرایی:

ئەوەی کێشەکە کەمێک ئاڵۆز دەکات، ئەوەیە دوو جۆر لە فەیلەسوفانی بوونگەرایی هەن، یەکەمیان: مەسیحییەکان، لەوانیش هەردوو فەیلەسوفی کاسۆلیکی کارل یاسپرز- **Karl Jaspers**- و جبریل مارسیل- **Gabriel Marcel**، دووەمیان: بێباوەڕەکان، وەک هایدگەر- **Heidegger**- و

من (واتە سارتەر) و چەند بیریارێکی فەڕەنسی دیکە. بەڵام ئەو شتەی لە نێوان هەردوو جۆرەکەدا هاوبەشە، ئەوەیە کە هەموو دەڵێن: بوون پێش بنەڕەت/ چییەتی (ماهیە)[4] کەوتووە، واتە پێویستە ئێمە لە خودگەرایی مرۆڤییەوە دەست پێبکەین، بەڵام مانای ئەمەش بە تەواوی چی دەگەیەنێت؟

بوون پێش چییەتی/ بنەڕەت کەوتووە..

ئەگەر بڕوانینە شتێکی دروستکراو لەلایەن مرۆڤەوە، بۆ نموونە کتێبێک یان چەقۆیەک، دەبینین ئەوە لە دەستکردی کەسێکە کە بیرۆکەیەکی تایبەتی بۆ هاتووە. کەسی دروستکار وێنەی کتێب وێنا دەکات و، لە دروستکردنەکەیدا ڕێگەی دانراوی نێو بیرکردنەوەکەی بەکاردەهێنێت، کە بەشێکە لەو وێنەیە.

ڕوانگەی تەکنیکی بۆ جیهان..

کتێب بە تەنیا شتێک نییە کە بە ڕێگەیەکی دیاریکراو دروستدەکرێت، بەڵکو هەروەها سوودێکی دیاریکراویشی هەیە و، ناکرێت وێنای پیاوێک بکەین کە ئامرازێک دروستدەکات بێئەوەی نەزانێت کەڵک و بایەخی چییە. بەمجۆرە دەڵێین: بنەڕەت/ جەوهەر بە نیسبەت کتێبەکەوە پێش بوونی کتێبەکە کەوتووە. لێرەدا چییەتی سەرجەم ئەو چۆنیەتییانەیە کە کتێبەکەی پێدەناسرێت و سەرجەم ئەو

ئامرازانەیە کـە کتێبەکـەی پـێ دروسـتدەکرێت، لەبەرئـەوەی بوونی کتێبەکە لەبەردەممدا، بوونێکی دیـاریکراوە، هــەروەها ڕوانگەشم بۆ جیهان ڕوانگەیـەکی تەکنیکییـە- **Technician**، بە ڕادەیەک دەڵێم: بەرهەم لێرەدا پێش بوون کەوتووە.

خودا و مرۆڤ لای بیریارانی سەدەی حەڤدە..

کاتێک وێنای خواوەندێکی خولقێنەر دەکـەین، لـە زۆربـەی کاتــدا وەک مــەزنترین دروســتکار وێنــای دەکــەین. ئــەو تیۆرییەش کـە دەیپـشکنین هـەرچۆنێک بێـت، ئەگـەر تیـۆری دیکارت بێت، یان تیۆری لایبنتز- **Leibnitz** بێـت، ئێمـە بـڕوا بەوە دەکەین کە ویست (الارادە) بەهەرجۆرێک بێت، بەدووی ئاوەزدا (ئەقڵدا) ڕێدەکات، یـان بـە لایـەنی کەمـەوە شـان بـە شانی ئاوەز دەڕوات، هەروەها بڕوا بەوە دەکەین؛ کـە خـودا لــە خولــقاندنی بوونەوەرەکانــدا دەزانێــت بــە وردی چــی دەخولقێنێت، کەواتە وێنەی مـرۆڤ لـە مێـشکی خـودادا وەک وێنەی کتێبەکە وایە لە مێشکی پیاوە دروسـتکارەکەیدا، خـودا بە پێی وێناکردنێکی دیاریکراو و ڕێگەیەکی تـەواو دیـاریکراو مرۆڤ بەرهەم دەهێنێت، هەروەک چۆن پسپۆڕێک کتێبێک لـە کتێبەکان، بە پشت بەستن بـە پێناسـەکەی و بـە پێـی ڕێگـەی نەخشەبۆکێشراو کتێب چێدەکات، بـەمجۆرە مرۆڤـی تاکگـەرا وێنــاکردنێکی دیــاریکراو و (هــەبوو) لــە مێــشکی خــودا-دا بەدیدەهێنێت.



سروشتی مرۆیی لای بیریارانی سەدەی هەژدە..

خودا لە سەدەی هەژدەدا و لەنێو وتەزاکانی بیریارانیدا زیندوو دەکەینەوە، لەو فەیلەسووفانەی پێیان وایە چییەتی پێش بوون کەوتووە، وەک دیدرۆ- **Diderot** و ڤۆڵتێر- **Voltaire** و تەنانەت خودی (کانت). لای ئەوان مرۆڤ سروشتێکی هەیە و سروشتەکەشی وێنەکەیەتی، کە لە هەموو مرۆڤێکدا دەیدۆزینەوە، بە جۆرێک هەموو مرۆڤێک دەبێتە هێنانەدییەکی تایبەتی بۆ وێنەیەکی گەردوونیی، کە ئەویش مرۆڤە. ئەوەش کە لەم (گەردوونێتی)یە بەرهەمدێت، بۆ نموونە لای (کانت) ئەوەیە پیاوی لێڕەوارێک و پیاوی سروشت و بۆرژواییێک، پێکەوە ملکەچی یەک پێناسە دەبن و یەک خەسڵەتی بنەڕەتییان هەیە. چییەتی/ بنەڕەت لێرەدا هەر بەو شێوەیە وێناکراوە کە پێش ئەو بوونە کاتییە (الزمنی) کەوتووە، کە لە سروشتدا وەریدەگرین.

بوونگەرایی بێباوەڕ..

بەڵام بوونگەرایی بێباوەڕ کە من (واتە سارتەر) نوێنەرایەتی دەکەم، یەکانگیرترە، لەوەدا کە تەنانەت لە حاڵەتی نەبوونی خواوەندی خوڵقێنەردا ڕایدەگەیەنێت؛ تاقە بوونەوەرێک هەیە، کە بە لایەنی کەمەوە، بوونەکەی پێش چییەتیەکەی کەوتووە، بوونەوەرێک پێش ئەوەی بتوانین



پێناسی بکەین، لە بووندایە، ئـەو بوونـەوەرەش مرۆڤـە، یـان هەروەک هایدگەر دەڵێت: (واقیعی مرۆییە). وەلی ئایـا مانـای پێشکەوتنی بوون لێرەدا بەرامبەر چییەتی، چـی دەگەیـەنێت؟ مەبەست لەوەیە کە؛ مرۆڤ پـێش هـەموو شـتێک هەیـە و بـە خودی خۆی دەگـات و لـە جیهانـدا وەدەردەکـەوێت، پاشـان دەناسێنرێت.

ڕوانگەی بوونگەرایی بۆ مرۆڤ..

ئەگـەر مـرۆڤ، هــەروەک فەیلەسـوفی بوونگــەرا وێنــای دەکات، لە تواناد‌ا نەبێت پێناسە بکرێت، ئـەوا لەبەرئـەوەی لـە سـەرەتادا شـتێکی ئـەوتۆ نییـە، بەڵـکو دوای ئـەوە و بـەو شـێوەیەی خـۆی دروسـت دەکـات دەبێتـە مـرۆڤ، کەواتـە بوونێک بۆ سروشتی مرۆیی نییـە، لەبەرئـەوەی بوونێـک بـۆ وێنـاکردنی خواوەنـد بـۆ سروشـتەکە نییـە. مـرۆڤ تـەنها بوونەوەرێکی هـەبووە، نـەک بـەو شـێوەیەی وێنـای خـودی خۆی دەکات، بەڵکو بەو شێوەیەی کە دەیەوێت و، پاش بوون وێنای دەکات؛ بەڵکو هەروەها بەو شێوەیەی لە هەڵـپەکردنیدا بەرەو بوون دەیخوازێت، مرۆڤ لە خودی خۆیدا لەوە زیـاتر کە دەیکات و پێی هەڵدەستێت چیدیکە نییە. ئـا ئەمەیـە یەکـەم پرەنسیپێک لە بوونگەراییدا. هەروەها هـەر ئەمەشـە کـە پێـی دەڵـێن خودگـەرایی و، بەرامبـەر ئـەم ناوزەدکردنـەش



تۆمەتبارمان دەکەن. بەڵام ئایا هیچ مەبەستێکمان لەوە زیاتر هەیە، کە جەخت لەسەر ئەوە دەکەین؛ مرۆڤ شکۆمەندە، بەرزتر لە شکۆداری هەر شتێکی دیکەی ماددی، هەروەها لەوەدا کە بوون و هەبوویەکە، بەو مانایەی مرۆڤ بوونەوەرێکە خۆی دەهاوێژێتە نێو پێشەنگەوە (داهاتووەوە) و ئاگاشی لەو خۆهاویشتنەیەتی.

پڕۆژە..

مرۆڤ لە سەرەتادا پڕۆژەی بوونێکە، لە خۆیەوە دەژی و هیچ شتێک لە ئاسمانی ماقووڵدا پێش ئەو پڕۆژەیە بوونی نییە. مرۆڤ نابێت، تەنیا بە گوێرەی ئەوەی لە نیازیدایە و لەو کردەیەی پێی هەڵدەستێت. ئەو نابێت، بە گوێرەی ئەوەی دەیەوێت، لەبەرئەوەی وەک دەزانین ویست بڕواکردنێکی هۆشیارانەیە، یان بڕیاردانێکی هوشیارانەیە و لای زۆرینەی خەڵکی پاش نواندنی کردەیەک دێت. دارشتنی کتێبێک و چوونە ڕیزی حزبێک و هاوسەری کردن لەگەڵ ژنێکدا، هەموو ئەمانە جگە لەوەی سیما و ڕووخسارەکانی هەڵبژاردنن، چی دیکە نین، زێدە لەوەی ویست بن، بنەڕەتی- **Originel** و هەرەمەکین و زیاتریش هەرەمەکییە.

هەمەکی بەرپرسیارێتی مرۆڤ..



ئەگەر بە ڕاستی بوون پێش چییەتی/ بنەڕەت کەوتبێت، ئەوا مرۆڤ بەرپرسیارە لەوەی کە هەیە، یەکەم هەنگاوی بوونگەراییش ئەوەیە؛ مرۆڤ بخاتە بەردەم بوونی خۆی و لێپرسراوێتی سەرتاپای بوونەکەشی بخاتە سەرشانی. ئەگەر بڵێین مرۆڤ بەرپرسیاری خودی خۆیەتی، ئەوا ئەوە نابەخشێت کە بەرپرسیارییەتیەکەی تەنها لە خودە دیاریکراوەکەیدا کۆبووبێتەوە، بەڵکو بەرپرسیارییەتیەکەی کۆی خەڵکانیش دەگرێتەوە، بە جۆرێک کە بەرامبەر ئەوانیش لێپرسراو دەبێت.

ڕەوتی (مەیلی) خودگەرایی – **Subjectivism** مانایەکی دووفاقی هەیە، نەیارانیشمان ئەو دووفاقییە دەقۆزنەوە، مانای یەکەم ئەوەیە؛ خودی تاکگەرا هەر خۆی خۆی هەڵدەبژێرێت، مانای دووەمیش کە واتایەکی قووڵی هەیە و بەرگری لە هەموو بوونگەرایی دەکات، ئەوە دەگەیەنێت؛ مرۆڤ ناتوانێت خودە مرۆییەکەی خۆی تێبپەڕێنێت.

هەڵبژاردن..

کاتێک دەڵێین مرۆڤ خۆی هەڵدەبژێرێت، مەبەستمان لەوەیە مرۆڤ بە هەڵبژاردنی خۆی، هەروەها خەڵکانی دیکەش هەڵدەبژێرێت، کردەیەک نییە لە کارەکانمان لە خوڵقاندنی بوونی ئێمەدا، وەک دەمانەوێت، کە ڕۆڵێک



نەگێـڕێت لـە خولـقاندنی وێنـەی مرۆڤـدا و بەشـدار نـەبێت، هەروەک لە ئەرکی بوونەکەیدا وێنای دەکـەین و بۆیـدەچین. هەڵبژاردنی ئێمە بۆ شێواز و مۆدێکی دیاریکراو لە مۆدەکانی بوون، هەر لە هەمان کاتدا جەختکردنە لەسەر بەهای ئـەوەی هەڵیدەبژێرین، لەبەرئەوەی ئێمـە نـاتوانین شـەڕ هەڵـبژێرین، بەڵکو ئەوەی هەمیشە هەڵیدەبژێرین خێرو چاکەیە بۆ خۆمان و بگرە بۆ هەموو خەڵکی[5].

مرۆڤ خودی خۆی و خەڵکانی دیکەش هەڵدەبژێرێت..

لە لایەکی دیکـەوە، ئەگـەر بـوون پـێش چییـەتی/ بنـەڕەت کەوتبێت و، ئەگەر ویستمان بوونی خۆمان لە کاتی داڕشتنی وێنە ئایدیالەکەماندا بهێنینەدی، ئەوا ئەم وێنەیە دەبێتە بـەهای بوونمان، نەک بە تەنیا بۆ خۆمان، بەڵکو بۆ هـەموو خەڵـکی و لـە هـەموو ئـەو سەردەمەشـدا کـە تێیـدا دەژیـن، بەمـەش بەرپرسیارێتیمان گەلێک لەوە زیـاترە کـە بـە بیرمانـدا دێـت، چونکە هەموو مرۆڤایەتی دەگرێتەوە. بۆ نموونە: ئەگـەر مـن کرێکارێک بم و چوونە پـاڵ سـەندیکای مەسـیحیم هەڵـبژارد، لـەبری ئـەوەی ببمـە کۆمۆنیـست و، ئەگـەر بـەم کردەیەشـم ویستم هێما بەوە بدەم کـە ملکـەچی دەبێتـە ڕێگەچارەیـەکی گونجاو بۆ مرۆڤ و مەملەکەتی مرۆڤیش لەم جیهانـەدا نییـە، ئەوا تێکـڕای ئەمانـە تـەنها مـن ناگرێتـەوە، بەڵـکو سـەرجەم



مرۆڤايەتی دەگرێتەوە، هۆکارەکەش ئەوەيە: من لە پێناو هەمووانادا ملکەچيم خواست.

کردەی تاک، سەرجەم مرۆڤايەتی دەگرێتەوە..

گەر بمەوێت کارێکی دياريکراو ئەنجام بدەم، کە تايبەت بێت بە خۆمەوە، وەک ئەوەی ژن بهێنم و زارۆکان بخەمەوە، ئەوا بەم کردەيەم تەنيا خۆمم نەگرتەوە بۆ هەڵبژاردنی يەک ژن، بەڵکو هەموو مرۆڤايەتيم گرتەوە، تەنانەت گەر ژنهێنانەکەشم بە بارودۆخ و ويست و ئارەزووی خۆمەوە بەسترابێتەوە. بەمجۆرە بەرپرسيارم بەرامبەر خۆم و بەرامبەر هەمووان، بۆئەوەی وێنەيەکی دياريکراوی مرۆڤێک ئافەريدە بکەم کە هەڵيدەبژێرم، کەوابوو بە هەڵبژاردنم بۆ خۆم، مرۆڤيش هەڵدەبژێرم. ئەوەی هەنووکە باسمان لێوەکرد، ڕێمان دەدات لە واتای وشەکان تێبگەين، ئەو وشانەی لە ڕووخسار و ڕووکەشدا بە باق و بريقن و لە واتاشدا ئاسانن، وەکو دڵەڕاوکێ و لێدوورکەوتنەوە و جێهێشتن و نائومێدی، کەوابێت مەبەستمان لە دڵەڕاوکێ و پەشێوی چييە؟

پەشێويی..



فەیلەسووفی بوونگەرا ڕایدەگەیەنێت کە؛ مرۆڤ پەشێوە (نیگەرانە)، واتە ئەو کەسەی پابەندە بە خودی خۆیەوە و دەرکیش بەوە دەکات کە ئەو نەک تەنیا بۆ خۆی هەڵبژێردراوە، بەڵکو لە هەمان کاتدا مرۆڤایەتی هەڵدەبژێرێت، ئەم کەسە، ناتوانێت لە هەستی بەرپرسیارێتی هەمەک و قووڵی خۆی دەرباز بکات.

زۆر کەس هەن کە لە واقیعدا پەشێو و نیگەران نین، بەلام ئێمە بە شاردنەوەی نیگەرانیەکەیان و خۆ قووتارکردنیان لێی تاوانباریان دەکەین، زۆربەیان لەو بڕوایەدان کە ئەوان بەو کارەیان تەنها بە خۆیانەوە پابەندن، تەنانەت ئەگەر لێیان بپرسین: ئەی ئەگەر هەموو کەسێک وەکو ئێوە ڕەفتاری نواند؟ لە وەلامدا دەڵێن: بەلام ئەوان واناکەن. ئەگەرچی ڕاستی ئەوەیە کە بەردەوام بپرسین: چی ڕوودەدات ئەگەر هەموو کەسێک بەو چەشنە ڕەفتار بنوێنێت؟ کەس ناتوانێت لەم پرسیارکردنە ڕابکات، تەنیا بە جۆرێک لە نیاز خراپییەوە- **Mauvaise foi** یان **disadvantage** نەبێت.

پەشێویی و نیازخراپی..

ئەو کەسەی درۆدەکات و پاساو بۆ خۆی دەهێنێتەوە و دەڵێت: (هەموو کەسێک ئەوە ناکەن)، ئەوە کەسێکە دڵ و ویژدان ئارام نییە، لەبەرئەوەی درۆکردن لە واقیعی خۆیدا

بەهایەکی گەردوونیی لەخۆگرتووە و وەک بەخششێک بەدرۆ دراوە. هەرچی نیگەرانییە (پەشێوییە) ئەوا هەر دەبێت دەربکەوێت، تەنانەت ئەگەر پەنهانیش بێت. ئەم نیگەرانییە بریتییە لەوەی کیرکێگارد – **Kierkegaared** پێی دەڵێت: (پەشێویی ئیبراهیم)، ئەم چیرۆکەش بەوە ناوزەدکراوە کە دەڵێت: فریشتەیەک داوا لە ئیبراهیم دەکات کە ئیسحاقی کوڕی سەرببڕێت.. هەموو شتێک ئاسایی دەبوو، ئەگەر فریشتەیەکی ڕاستەقینە بهاتایەو بە ئیبراهیمی بووتایە: ئەی ئیبراهیمی کوڕەکەت سەربڕە، وەلی هەریەکێک لە ئێمە دەتوانێت بپرسێت: ئایا ئەو بە ڕاستی ئیبراهیمە و ئەو فریشتەیەش بە ڕاستی فریشتەیە؟ ئەی چۆن هەموو ئەمانەم بۆ دەسەلمێنێت؟

ژنێکی شێت هەبوو، دووچاری نەخۆشی ئەندێشەیی و خەیاڵپلاوی هاتبوو، بە تەلەفۆن گوێی لە ئاخاوتن و چەندەها فەرمایشتان دەبوو، پزیشکێک لێی پرسی: کێ لەگەڵتدا قسەدەکات؟ ژنەکە لە وەڵامدا دەڵێت: ئەوە (خودایە). کێ بۆ ژنەکەی دەسەلمێنێت کە ئەو کەسە خودایە؟ ئەگەر فریشتەیەک دەهاتە لای من، کێ بۆ منی دەسەلمێنێت کە ئەوە فریشتەیە؟ یان ئەگەر گوێم لە چەندین دەنگی جیاجیا بێت، ئەوا کێ بۆم بسەلمێنێت کە ئەو دەنگانە لە ئاسمانەوەن، یان لە دۆزەخەوەن، یاخود چاوگەکەی لەژێر ئاگایی یان لە



حاڵــەتێکی نەخۆشـــی دەستنیـــشانکراوەوەیە! بەڵـــکو کـــێ دەیسەلمێنێت ئەوە ڕووبەڕووی من کراوەتەوە؟

کەواتە کێ بە شـێوەیەکی تایبـەتی دەیـسەلمێنێت مـن بـە باشی ئامادەگیم هەیە بۆ سەپاندنی وێناکردنم سـەبارەت بـە مرۆڤ و هەڵبژاردنیشم بۆی لە سەرووی مرۆڤایەتییەوە؟ من هیچ سەلماندنێک و هیچ هێما و نیـشانەیەکی ئـەوتۆش بـەدی ناکەم باوەڕم پێبهێنێت، ئەگەر گـوێم لـە دەنگێـک بـوو بـانگم دەکات، ئەوا خۆم بڕیاردەدەم ئەوە دەنگی فریشتەیە یـان نـا، ئەگەر کارێکیشم بە کردەیەکی چاک دانا، ئەوا خۆم بـڕیاریش دەدەم کە ئەم کارە چاکەیە یان خراپەیە. شتێک نییە پابەنـدی ئەوەم بکات کە وەکو ئیبراهیم بم، بەڵام لە هەموو چرکەیەکدا بەوەوە پابەندم کە وەکـو ئـەو ڕەفتـار بنـوێنم و ئـەو کارانـە ئەنجام بدەم کە شایان و نموونە بن. شـتەکان بـە شـێوەیەک ڕێدەکەن، دەڵـێی هـەموو مرۆڤـایەتی سـەرنج دەخاتـە سـەر کردەوەکانی هـەموو مرۆڤـێک و، مرۆڤـایەتیش بـە نیـسبەت مرۆڤەوە خۆی ڕێکدەخات.

لەسەر هەموو کەسێکە بپرسێت: ئایا مافی ئەوەم هەیە بـە شێوەیەک ڕەفتار بنوێنم کە شایان و نموونەی ئـەوتۆ بم بـۆ خەڵکی؟ خۆ ئەگەر ئەو پرسەش نـەکات، ئـەوا پەشـێوییەکەی خۆی دەشارێتەوە.



پەشێوی نابێتە هۆی داهێزران..

پەشــێویی لێـرەدا ئـەوە نییـە کـە دەبێتـە هـۆی هـێمنی و داهێزران، بەڵکو پەشێویی و نیگەرانییـەکی سـادە و سـاکارە، هــەموو ئــەو کەســانە تاقییــان کردۆتــەوە کــە بەرگــەی لێپرســـــراوێتییەکانیان گرتـــــووە، بـــۆ نموونــــە: ئەگـــەر فەرماندەیەکی سەربازی ئەرکی هێرشێکی لە ئەستۆ گرت و ژمارەیەک لـە سـەربازەکانی ڕووبـەڕووی مـەرگ کـردەوە، ئەوا هەر خۆی ئەو کارەی بـە دەسـتی خـۆی هەڵـبژاردووە. گومانی تێدانییە کە ئەو لە ژوور خۆیەوە فەرمایشی بۆ دێـت، ئەو فرمانانەش ورد نین و پێویـستیان بـەوە هەیـە لـە لایـەن خۆیـەوە بـە چەشـنێک ڕاڤـە و لێکدانـەوەیان بـۆ بکـات کـە چارەنووسی ژمارەیەکی دیاریکراو لە کەسـانێک دیارییبکـات. مەحاڵە ئەو فەرماندەیە بڕیارێک بدات بێ ئـەوەی کـە بەهـەر شـێوەیەک بێـت نیگـەران نـەبێت، هــەموو فەرمانـدەکان لــەو نیگەرانیــەدا پــسپۆڕن، بــەڵام ئەمـــەش ڕێگــەی کــارکردنی لێنەگرتوون، بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئەوە مەرجێکی کارەکەیانە کە پێداویستی بیرکردنەوەیان لە چەندین ئەگەردا بەرجەسـتە دەکات. یەکێک لەو ئەگەرانە هەڵدەبژێرن و دواتر بەهایەک بە هەمان ئەو هەڵبژاردنە دەبەخشن.

پەشێویی و بەرپرسیاریی..



ئـەو پەشـێوییەی بوونگـەرایی وەسـپی دەكـات، بـەوە شیدەكرێتەوە كە بەرپرسیارییەكی ڕاستەوخۆیە سەبارەت بە كەسـانی دیكـە، كـە ئـەوانیش دوچـاری هـەمان پەشـێویی بوونەتەوە، ئەوەش بەربەستێكی وانییـە كـە لـە كـار جیامـان بكاتەوە، بەڵكو بەشێكە لەو.

بەجێهێشتن..

كاتێـك بـاس لـە بەجێهێـشتن (**delaissement** یـان **dislodage**) دەكـەین، كـە ئـەمیان دەربـڕینێكی هێژایـە لای هایدگەر، دەمانەوێت تەنیا ئەوە بڵێین كە خودا لە بووندا نییـە و دەبێـت ئـەو ئاكامانـە وەچنـگ بێـنین كـە هـەر لـە سەرهەڵدانیانەوە تا كۆتاییان لەوەوە چێدەبن.

ئاكاری عیلمانیگەری..

بیریاری بوونگـەرا بـە توندی بەرپـەرچی تـەنز و مـۆدی ئاكاری عیلمانیگـەری (**Moral laique** یـان **laical moral**) دەداتەوە، كە دەیەوێت، بە كەمترین هەوڵ خـودا بخاتـە لاوە. هەندێک لە بیریـارانی سـەدەی نـۆزدەو دەوروبـەری ساڵـی (١٨٨٠)دا، ویـستیان ئاكـاری عیلمانیگـەری دابمـەزرێنن و ڕایانگەیاند: خودا گریمانەیـەكی بێفـەڕە و پێویـستە لاببرێـت. كاتێكیش هەبوونی ئاكار و كۆمەڵگە و جیهانێكی پـەتی بـوون بـە شـتە پێویـستەكان، هـەروەها وا پێویـستی كـرد كـە



دابونەریتێک هەبێت و بە شێوەیەکی جیدی لێی بڕوانێت، بەوپێیەی پێشینەییە – **apriori**، واتە پێش ئەزموون کەوتووە، کەواتە لە ڕووی پێشینەییەوە پێویستە مرۆڤ مەردبێت و درۆنەکات و لە ژنەکەی نەدات، بەڵام ئێمە لێرەدا هەوڵ دەدەین بوونی ئەو دابونەریتانە بخەینەڕوو، کە لە ئاسمانی ماقووڵ و پەسەندا کێشراوە، سەرەڕای ئەوەی خودا لە دیدی ئێمەدا بوونی نییە.

ڕادیکاڵیزم (ڕیشەییخوازی)..

بە مانایەکی دی، هەروەک ڕادیکاڵخوازان دەڵێن: (هیچ شتێک ناگۆڕێت، ئەگەر خود لە بووندا نەبێت). ئێمە ئەو یاسایانە دەبینینەوە کە وابەستەن بە پاکژیو مرۆڤایەتییەوە و، بەم کارەش خودامان کردۆتە گریمانەیەکی گەندەڵ کە لە خۆیەوە دەمرێت. ئەگەرچی بڕوای بوونگەرایی بە پێچەوانەی ئەمەوەیە، شتێکی زۆر جارسکەرە کە خودا لە بووندا نەبێت، چونکە ئەگەری هەبوونی دابونەریتیش لە ئاسمانی ماقووڵ و پەسەندا ناهێنێت، ئەوکاتە، چاکەش بە شێوەیەکی پێشینەیی نایەتەدی، چونکە ویژدانێکی تەواوی بێکۆتا نابێت ئەو چاکەیە پەسەند بکات. ئەوکاتە باسکردن لە بوونی چاکە یان بە پێداویستی ڕاستگۆیی و پاکی، دەبێتە باسێک کە مانای نییە، چونکە ئێمە تەواو دەکەوینە بوارێکی مرۆیی پوختەوە.



دۆستۆیۆڤسکی و بوونگەرایی..

دۆستۆیۆڤسکی (Dostoievsky یان Dostoyevsky) دەڵێت: "ئەگەر خودا لە بووندا نەبووایە، ئەوا هەموو شتێک حەلاڵکراو/ ڕەوا دەبوو". ئا ئەمەیە خاڵی سەرهەڵدانی بوونگەرایی و، بە ڕاستیش هەموو شتێک لە حاڵەتی نەبوونی خودادا حەلاڵکراو/ ڕەوا دەبوو، ئەوکاتە مرۆڤ دەبووە بەجێهێڵراو- وازلێهێنراو، چونکە نە لە خۆیدا و نە لە دەرەوەی خۆیدا توانستێکی بەدینەدەکرد کە خۆی پێوە وابەستە بکات، بگرە هیچ پاساو و بیانووهێنانەوەیەکی نەدەبینییەوە. ئەگەر بە ڕاستی بوون پێش چییەتی/ بنەڕەت کەوتبێت، ئەوا هەموو ئەو شیکردنەوانەی کە بۆ سروشتی مرۆیی دەگەڕێنەوە و بەخشراو و سەقامگیرن، شیکردنەوەیەکی مەحاڵە، چ جێگەیەک بۆ هەربوونایەتی (حتمیە) نەدەمایەوە، لەبەرئەوەی مرۆڤ ئازادە، بەڵکو مرۆڤ خۆی بریتییە لە ئازادی.

مرۆڤ ئازادییە..

لە لایەکی دیکەوە، ئەگەر خودا بوونی نەبێت، ئەوا لە بەردەمماندا زنجیرەیەک دابونەریت یاخود پەیڕەو- سستەم بەدی ناکەین، کە بتوانێت پاساو بۆ ڕەفتارەکانمان بێنێتەوە. بەم پێیە نە لە پێشمانەوە و نە لە پاشمانەوە چ بوارێکی ئەوتۆ



بـۆ دابونەریتـە ڕۆشـنەکان نەماوەتـەوە کـە جێـی پاسـاو و بیانوویەک بێت. سـەبارەت بـە مرۆڤـیش وا دەریدەبـڕم کـە؛ مرۆڤ حوکمی ئازادی بەسـەردا بڕدراوەتـەوە، لەبەرئـەوەی مرۆڤ خۆی نەخوڵـقاندووە، لـە لایـەکی دیکەشـەوە ئـازادە، لەبەرئەوەی بەرامبەر ئەو کردەیەی دەیکات لێپرسراوە، هـەر تەنیا بە فڕێدانیەوە لە جیهاندا.

بیریاری بوونگەرا بڕوای بە هێزی سـۆز – **Passion** نییـە و هـەرگیز بـیر لـەوەش ناکاتـەوە کـە سـۆزی بـە جـۆش تەوژمێکی وێرانکارە و هـەردەبێت مـرۆڤ دووچـاری چەنـد کردەیـەکی دیـاریکراو بکاتـەوە و، دواتـر ببێتـە بەهانـە و پاساوێک بۆی، بەڵکو بە پێچەوانـەوە، فەیلەسـوفی بوونگـەرا لـەو بڕوایەدایـە؛ مـرۆڤ بەرامبـەر ئارەزووەکـانی خـۆی بەرپرسیارە و توانای پـشتبەستنی بـەو ئاماژانـەوە نییـە کـە ئاراستەکەی نیشاندەدات، بگرە مرۆڤ ئـەم ئاماژانـە بـە پێـی خواستی خـۆی لێکدەداتـەوە. لەبەرئـەوە، مـرۆڤ کاتێـک لـە هـەموو پاڵپـشتی و هاریکارییـەک دادەماڵـرێت، لـە هـەموو ساتێکدا ئـەوە بەسـەریدا دەسـەپێنرێت کـە مـرۆڤ ئافەریـدە (داهێنان) بکات.

مرۆڤ ئافەریدەکاری مرۆڤە..

پۆنگ- **Ponge** لـە وتارێکـدا وتوویـە: "مـرۆڤ داهـاتووی مرۆڤە". گەر مەبەست لەم وتەزایە ئەوە بێت کـە داهـاتوو لـە



ئاسمانەوە نووسراوە و خودا دەیبینێت، ئەوا قسەیەکی بێمانا و پڕوپووچە و، ئەوکاتە هیچ داهاتوویەکیش لە ئارادا نەبوو. بەڵام ئەگەر مەبەستی لەوە بێت کە پێویستە مرۆڤ، هەرچۆنێک بێت، ئەو چارەنووسی زووە دروستبکات کە چاوەڕێی دەکات، ئەوکاتە وتەکە ڕاستە.

بەجێهێشتن..

بەڵام مرۆڤ لەم حاڵەتەدا بەجێهێڵراوە، بۆ ئەوەش کە مانای بەجێهێشتن یەکالا بکەمەوە، نموونەیەک دەهێنمەوە و باس لە حاڵەتی یەکێک لە خوێندکارەکانم دەکەم، کە لەم بارودۆخەی خوارەوەدا هاتەلام:

ئەم لاوە باوکێکی هەیە کە لەگەڵ دایکیدا ناکۆکەو یاریدەی دوژمنان دەدات، برایەکیشی لە هێرشی ئەڵمانییەکاندا ساڵی (١٩٤٠) کوژراوە و ئەو دەیویست بە هەست و سۆزێکی تاڕادەیەک سەرەتاییەوە تۆڵەی بسێنێتەوە، بەڵام بە هەست و سۆزێکی جوامێرانە، ئەم لاوە بە تەنیا لەگەڵ دایکیدا دەژیا، کە هەردەم بە خیانەتی مێردەکەی و کارەساتی کورە کوژراوەکەی غەمبار بوو.

لەم کاتەدا لاوەکە وا پێویستی دەکرد یەکێک لەم دوو ڕێگەیە هەڵبژێرێت: یان بچێتە ڕیزی هێزە فەڕەنسییە



ئازادەکانەوە لە (بەریتانیا)، یاخود لای دایکەکەی بمێنێتەوە و هاریکاری گوزەرانی بێت.

ئـەو دەیـزانی کـە دایکـی بـە هـۆی بـوونی کوڕەکەیـەوە لەگەڵـیدا دەژی و، بـە بزربـوون یـان مـردنی کوڕەکـەی لـە بێئومێدیدا نوغرۆ دەبێت، هەروەها دەیـزانی کـە هـەرکارێکی بەرامبەر دایکـی بـە ئـەنجامی دەگەیـەنێت، بایـەخ و مـەودای خۆی هەیە، بەو مانایەی هاریکاری دایکـی دەبێـت لـە ژیانـدا. لەگەڵ ئەوەشدا هەر هەنگاوێکی بەرەو جەنگ بنایە، بـە فیـڕۆ دەچوو، چونکە ناتوانێت بچێتە ڕیزی جەنگاوەرانـەوە، ڕەنگـە وەک بەندکراوێک لە ئیسپانیادا بمێنێتەوە، ئەگـەر هەوڵـیدا بـە خاکەکەیدا تێبپەڕێت، یان ببێتە وەکیلێکو کـاری نوسـینگەیەک لـە جـەزائیردا بکـات، ئەگـەر هـەوڵ بـدات یەکـەمجار بـەرەو باکووری ئەفریقیا هەڵـبێت. ئـەو هـەر لـە بـەردەم دوو جـۆر کـاری جیـاوازدا بـوو: یـەکێکیان ڕاسـتەوخۆ و لەبـەرچاوە، ئەگەرچی ئاراسـتەی تاقەکەسـێک کراوەتـەوە، دووەمیـشیان ئاراستەی کۆمەڵێک کراوەتـەوە، کـە زۆر فراوانتـرە، ئـەویش کۆمەڵـەی نەتەوایەتییـە، بـەڵام ئـەو بـە هـۆی ئـەو کـارەوە دوچاری پچڕان و نوشووستی دەبێتەوە.

دوو جۆر لە ئاکار (خووڕەوشت)..

لەو کاتەدا لاوەکە کەوتبووە نێوان دوو جۆر لە ئاکـارەوە؛ ئاکـــاری هاوســـۆزی و خۆبەخـــشین، لەگـــەڵ ئاکـــارێکی بـــەرفراوانتردا، لـــەچاو یەکەمیانـــدا زامـــن بـــوون و کاریگەرییەکەی کەمتر بوو. دەبووایـە ئـەم لاوە یـەکێک لـەم دووانە هەڵبژێرێت، کـێ دەتوانێـت لـەوەدا هاریکـاری بکـات؟ باوەڕی مەسیحیەت؟ نەخێر، ئەو باوەڕە دەڵێت: "کەسوکاری خۆتـان خۆشـبووێت و خۆتـان لـە پێناویانـدا بـەخت بکـەن، هەمیشە ئەو ڕێگەیە هەڵبژێرن کە لە ڕێگەکانی دیکـە سـەخت ترە". بەلام لێرەدا دەپرسین: کام ڕێگەیە لەوانی دیکە سەخت ترە؟ کێ خۆشەویستی خۆی وەک کەسوکارێک دەردەخـات! دایک یان ئەو جەنگاوەرەی لە بەرەی جەنگدایە؟ کـوا بایەخـە مەزنەکـەی؟ ئایـا لـە جـەنگبازی کۆمەڵـێکی گەورەدایـە و، ئەوکاتــەش بایەخەکــەی ئاڵــۆزو تەڵــخ دەبێــت! یــاخود لــە یاریدەدانی بوونەوەرێکدایە لـە ژیانـدا و ئەوکاتـە سـوودەکە سنووردار دەبێت؟ لە هەموو ئەوانەشـدا، کـێ بـە شـێوەیەکی پێشینەیی بڕیار دەدات؟ هیچ کەسێک و تەنانەت هیچ ئاکارێکی نووسراو نییە.

پەندی ئاکار کانتیزم..

ئاکاری کانتیزم دەڵێت: "مامەڵەی کەسانی دیکـە وامەکـەن کە گوایە ئامرازن، بەڵکو بەوپێیەی ئامانجن". باشە، ئەگەر من



لەگەڵ دایکمدا مامەوە و بەوپێیە مامەڵەم لەگەڵدا کرد کـە ئـەو ئامانجە نەک ئامراز، ئـەوا لـەم حاڵـەتەدا بـە جۆرێـک مامەڵـە لەگەڵ ئەوانەدا دەکەم کە لە دەوروبەرمدا شەڕ دەکـەن، وەک ئەوەی ئەوان ئامرازبن. لـە لایـەکی دیکـەوە، ئەگـەر چوومـە ڕیزی جەنگاوەرانەوە و بە جۆرێک مامەڵـەیان لەگەڵـدا بکـەم کە ئەوان ئامانجن، ئەوا لـە هـەمان کاتـدا خـۆم ڕووبـەڕووی مامەڵـەکردنێک کردۆتـەوە لەگـەڵ دایکمـدا، بەوپێیـەی گوایـە ئامرازێکە.

نەریت (بەها) و سۆز..

ئەگەر دابونـەریت شـاراوە بێـت و هەمیـشە لـە حاڵـەتێکی دیاریکراو و پشکنراو فراوانتر بێـت، هـەروەک باسمـان کـرد، ئەوا هیچ شتێک لەبەردەممانـدا نامێنێتـەوە، ئـەوە نـەبێت کـە ڕوو لە غەریزەکانمان بکەین، هەر ئەمـەش بـوو کـە، لاوەکـە هەوڵیدا بیکات، ئەو دەیوت: ئەوەی لە بنەڕەتدا گرنگە میهـر و سـۆزە و، ئـەوەی پێویـستە هەڵـیبژێرم ئەوەیـە کـە بـەرەو ئاراستەیەکی دیاریکراو پاڵم پێـوە دەنێـت، ئەگـەر وا هەسـت بکەم کە من دایکمم خۆشدەوێت و خۆم لە پێناویـدا بەختکـەم و، هـــەموو حـــەزێکم لـــە تۆڵـــەکردنەوەو هـــەموو کـــار و سەرکێـشییەکم لـە پێناویـدا بێـت، ئـەوا لـە نزیـک دایکمـدا دەمێنمەوە، بەڵام ئەگەر هەسـتم کـرد خۆشەویـستییەکەم بـۆ

دایکم هێندە زۆر نییە، ئەوا بەجێمدەهێشت و دەڕۆیشتم. بەڵام چۆن دەتوانین بەهای میهر و سۆزێک دیاری بکەین؟ ئەی کامەیە سەرچاوەی بەهای میهر و سۆزی ئەولاوە بەرامبەر دایکی؟ ئەوە تەنها مانەوەی لاوەکەیە لە پێناو دایکیدا. من دەتوانم، بۆ نمونە: هاوڕێکەم بە ڕادەیەک خۆشدەوێت کە بڕێک پارە لە پێناویدا بەخت دەکەم، بەڵام ناتوانم ئەم وتەیە هەر بە قسە بکەم، گەر بە ڕاستی لە پێناویدا پارە بەخت نەکەم. بەم شێوەیە من دەڵێم: دایکم بە ڕادەیەک خۆشدەوێت کە لەلای دەمێنمەوە، ئەگەر بە ڕاستی لەلای بمێنمەوە. بەمجۆرە من ناتوانم بەهای ئەم سۆزەم دیاری بکەم، ئەگەر کارێک ئەنجام نەدەم و ڕاستی قسە و کردەکەم نەسەلمێنێت. هەرچەندە من کاتێک داوا لەم هەست و سۆزەم دەکەم پاساو بۆ خودی کردەکەم بهێنێتەوە، خۆم لە نێو بازنەیەکی بۆشدا دەبینمەوە.

سۆز لە کردەوەکانمانەوە پێکدێت..

لە لایەکی دیکەوە، (ئەندریە جید) دەڵێت: "ئەو سۆزەی دەینوێنم و ئەو سۆزەی تیایدا دەژیم، هەردووکیان شایانی جیاوازی کردن نین" بڕیار لەسەر خۆشەویستیم بۆ دایکم بدەم، بە مانەوەم لەگەڵیدا و، پاساوێک بدۆزمەوە بۆئەوەی لەلای دایکم بمێنمەوە، هەردووکیان تا ڕادەیەک هەر یەک



شتن. ئەمەش مانای ئەوەیە؛ سۆز بە پێی ئەو کردەوانە بنیاد دەنرێت کە ئـەنجامیان دەدەم و دواتـریش نـاتوانم بـۆ لایـان بگەڕێمەوە یان بیدۆزمەوە. ئەمە هەروەها ئـەوە دەگەیـەنێت مـن نـاتوانم لـە حالـەتی ئـەو مافـەی پالـم پێـوە دەنێـت بـۆ کارکردن، بە دوای خۆمدا بگەڕێم، نە دەشـتوانم داوا لـە هـیچ ئاکارێک بکەم بیرۆکەم بـداتێ و ڕێگـەم بـدات ئـەو کـارە بـە ئەنجام بگەیەنم.

هەڵبژاردن و پابەندبوون..

ڕەنگـە ئێـوە بـڵێن: ئـەو لاوە لانی کـەم چـووە ڕاوێـژ بـە مامۆسـتاکەی بکـات. بـەلام ئەگـەر ئێـوە، بـۆ نموونـە ڕای قەشەیەک وەربگرن، ئەوا تا ڕادەیەک دەزانن بەڕای ئەو چـی هەڵدەبژێرن، ئەویش بە گوێرەی ئەو ئامۆژگارییـەی لـەوەوە وەریدەگرن. ئەمەش مانای ئەوەیە؛ هەڵبژاردنی ڕاوێژکار لـە خـودی خۆیـدا، پابەندبوونـە. بەڵـگەش بـۆ ئەمـە؛ ئەگـەر تـۆ مەسـیحییەک بیـت، دەتـووت: ڕاوێـژ بـە قەشـەیەک دەکـەم. ئەگـەرچی هەنـدێک قەشـە هـەن کـە یاریـدەی ئەڵـمانییەکان دەدەن و، هەنـدێکی دیکەشـیان بـەرەنگاری داگیرکـەران دەکەن. لەبەرئەوە تۆ کامیـان هەڵـدەبژێریت؟ ئەگـەر لاوەکـە قەشەیەک هەڵبژێرێت کـە بەرهەڵـستی دوژمـن دەکـات، یـان قەشـەیەک کـە یاریـدەی دوژمـن دەدات، ئـەوا خـۆی بـڕیار

لەسەر چەشن و جۆری ئەو ئامۆژگارییە دەدات، کە وەریدەگرێت.

ئاکاری گشتی بوونی نییە..

بەم شێوەیە، کاتێک ئەو لاوە هاتە لام، دەیزانی وەڵامە چاوەڕوانکراوەکە چییە، ئەویش تاکە وەڵامێکە: تۆ ئازادیت بۆ هەڵبژاردن و بۆ داهێنان، چونکە هیچ ئاکارێکی گشتی نییە بتوانێت ڕێگەی ئەو ئەرکەت نیشان بدات، لەبەرئەوەی لەم جیهانەدا ئەو ئاماژانە بوونیان نییە کە شایانی لێکدانەوەن. هەرچەندە کاسۆلیکەکان بە پێچەوانەی ئەمەوە، ئاوا وەڵام دەدەنەوە: چەند ئاماژەیەک هەن، ئەگەر بڕوایان پێبکەیت، ئەوا ئەو شتەی مانایەک بەم ئاماژانە دەبەخشێت، ئەوەیە: هەریەکێک لە ئێمە خواست و ویستی خۆی هەیە.

لە تاراوگەدا کەسێکی بەڕێزم ناسی، ئەویش ڕەبەنێکی یەسوعی بوو، کە بەم شێوازە چووبووە نێو ڕەبەنییەوە: پاش ئەوەی لە چەند بۆنەیەکدا دوچاری نوشووستییەکی تاڵ بووبۆوە،

١-کاتێک باوکی مردووە کە ئەو منداڵ بووە و بە هەژاری جێیهێشتووە، لە دەزگایەکی خێرخوازدا خوێندویەتی و چاودێرییەکی تایبەتی کراوە، بەڵام هەردەم هەستی بە هەژارییەک کردووە کە بە سەدەقە و چاکە دەگوزەرێت.



٢-چەندین بڕوانامەی بەرزی لەکیس چووە، کە منالان دڵی پێخۆش دەکەن.

٣-لە تەمەنی هەژدەساڵیدا و لە پەیوەندییەکی سۆزداریدا هیوابڕاو بووە، دواتر لە تەمەنی بیست و دوو ساڵیدا، لە خۆسازدانی سەربازیدا سەرکەوتوو نەبووە، ئەم شکستهێنانە ئەو خاڵەیە کە دەڵێت: جامەکەی پڕبووە و لێی دەڕژێت.

ئەم لاوە لەو بڕوایەدا بووە کە لە هەموو شتێکدا هیوابڕاو بووە، لەمەشدا نیشانەیەک هەیە، بەڵام نیشانەی چ شتێکە؟ ئەو دەیتوانی، بۆ نموونە ڕوو لە خەم و بێهیوایی بکات، بەڵام بە لێهاتوویەکی ڕێژەییەوە توانی زاڵ بێت. هەموو ئەوانە وا ڕادەگەیەنن کە؛ ئەمە بانگهێشتێک نییە بۆ شکۆمەندی کاتیی، بەڵکو بۆ پیرۆزکردنی ئایینیە، وەک باوەڕ و پیرۆزیی. ڕەنگە ئەو لە پشت ئەو باوەڕەیەوە ویستی (ارادە) خودای بینیبێت، لەبەرئەوەش بووە بە ڕەبەن.

کێ لەو بڕوایەدا نییە کە درکاندنی مانای ئەو ئاماژەیە تەنیا لە لایەن خۆیەوە بووە و، دەشێت لە نووشووستییە دووبارەبۆوەکانییەوە شتێکی دیکە وەبەر بهێنێت، وەک ئەوەی بۆ نموونە؛ بە کەڵک بێت بۆ بازرگانی، یان بۆ شۆڕش، کەواتە ئەو بۆ خۆی بەرپرسیارێتی تەواوی لێکدانەوەکە لە ئەستۆ دەگرێت.

بێهیوایی..

بەجێهێشتن، هەڵبژاردنی خودی خۆمان لەلایەن خۆمانەوە دەگرێتەخۆ، ئەمەش هاوشانی نیگەرانییە، بەڵام بێهیوایی، لە واتاکەیدا سادە و ساکاری دەگەیەنێت. مەبەست لەم دەربڕینە ئەوەیە؛ پشت بە هەموو ئەو شتانە ببەستین کە بە ویستی خۆمانەوە بەستراوە، یاخود پشت بەو کۆمەڵە ئەگەرانە ببەستین کە کردەوەکانمان بە باری شیاودا هەڵدەسوڕێنن.

شیاوەکان- ئەگەرەکان..

کاتێک مرۆڤ شتێکی دەوێت، هەمیشە چەندین توخم و ڕەگەزە جیاجیاکانی شیان و گونجان لە بەردەمدا دەبێت، بۆ نموونە: من چاوەڕێی هاتنی هاوڕێیەکم دەبم کە بە شەمەندەفەر یان بە (ترام) دێتە لام، ئەمەش ئەگەری گەیشتنی شەمەندەفەرەکە لە کاتێکی دیاریکراودا دەیسەپێنێت، هەروەکو چۆن ئەگەری دەرنەچوونی (ترام)ەکە لە هێڵەکەشی دەیسەپێنێت، من بەمجۆرە لە بواری ئەگەر و شیاندا دەمێنمەوە. هەرچەندە پشتبەستن بە شیان و ئەگەرەکان بەجێ نابێت، تەنیا لەو کاتانەدا نەبێت کە کارەکەم سەرجەمی ئەم ئەگەرانەی لەخۆگرتبێت. بەڵام ئەگەر ئەو



شیاوانە بە تەواوەتی بەکارەکەی منەوە پابەند نەبن، ئەوا پێویستە بایەخی پێنەدەم، لەبەرئەوەی هیچ مەبەستێک، یان هیچ خواوەندێک نییە کە لە توانایدا بێت جیهان و ئەگەرەکانی بە گوێرەی ویستی من پێکەوە بگونجێنێت.

بێهیوایی و کار..

کاتێک دیکارت دەیوت: "سەرکەوتنی مرۆڤ بەسەر خۆیدا گرنگترە لە سەرکەوتنی مرۆڤ بەسەر جیهاندا"، مەبەستی ئەوە بوو کە؛ پێویستە مرۆڤ بەبێ تکا و پاڕانەوە کاربکات. بەڵام ئەو مارکسییانەی وتووێژم لە تەکیاندا سازداوە، لە وەڵامی ئەمەدا دەڵێن: (دەتوانیت لە کارەکەتدا، کە مردن تخووبی بۆ دەکات (دیاریدەکات)، پشت بە کەسانی دیکە ببەستیت، بە واتای چییان لەدەست دێت لە پێناو هاریکاری تۆدا، بۆ نموونە لە چین بن یان لە ڕوسیا، هەروەها پشت بەوەش ببەستیت کە پاش مردنی تۆ چیدەکەن، لە پێناو بەڕێوەچوونی کارەکەدا تا بە پایان دەگات، بەو واتایەی بەهۆی شۆڕشێکەوە تەواوی دەکەن. ئەرکی سەرشانی تۆیە پشت بەو یاریدەیە ببەستیت، دەنا تۆ پیاوێکی جوامێر و چەلەنگ نیت).

بەڵام من (واتە سارتەر) لە وەڵامدا دەڵێم: من لە تێکۆشاندا پشت بە هاوڕێکانم دەبەستم، بە ڕادەی پابەندبوونیان



لەگەڵـــمدا، لـــە تێکۆشـــانێکی هاوبەشـــی دیـــاریکراودا، لـــەو یەکێتییەی لە حزبێکی دیاریکراو ڕەخساوە، یاخود لەو دەستە و کۆمەڵەیەی کە تا ڕادەیەک دەتـوانم چـاودێری بکـەم، واتـە بەو شێوەیەی کە من لە ڕیزەکانیدا تێکۆشەرێک دەبم و دواتر لە هەموو ساتێکدا سەرنج لە بزاوتنـەکانی دەدەم. لەوکاتـەدا، پشت بەستنەکەم بـە یـەکێتی ئـەو حزبـە یـان ئـەو کۆمەڵـەیە هەروەک ئەو پشت بەستنەم وایە لە هـاتنی شـەمەندەفەرەکە لە کاتی دیاریکراودا.

سروشتی مرۆیی بوونی نییە..

ئەگـەرچی مـن نـاتوانم پـشت بـە کەسـانێک ببەسـتم کـە نایانناسم و تەنها بە دڵپاکی مرۆڤ و بایەخـدانی بـە چاکـەی کۆمەڵگە پشت ئەستوور دەبم، ئـەویش لەبەرئـەوەی مـرۆڤ ئازادە و، لەبەرئەوەی سروشتی مرۆیـی بنەمایـەکی ئـەوتۆی نییە، کە بتوانم وەک بناغەیەک شتێکی لەسـەر بوونیـاد بنـێم. بۆ نموونە: من نازانم چارەنووسـی شۆڕشـی ڕوسـی چـۆن دەبێت، ڕەنگە پێی سەرسام بم و وەک نموونەیەکی لە قەڵـەم بدەم، بەو ڕادەیەی کـە ئەمـڕۆ ئـەوەم بـۆ دەسـەلمێنێت کـە: پڕۆلیتاریا لە ڕوسیادا ڕۆڵێک دەگێڕێت، کە لە هـیچ میللـەتێکی دیکەدا نایگێڕێت، هەرچەندە من ناتوانم جەختی ئەوە بکەم کە شۆڕشەکە هەر دەبێتە هۆی سـەرکەوتنی پـڕۆلیتاریا، بەڵـکو

دەبێت ئەوەندەم پێ بەس بێت کە لە بەردەمی خۆمدا دەیبینم، چونکە من بۆ نموونە لەوە دڵنیا نیم کە هاوڕێکانم لە تێکۆشاندا پاش مردنم درێژە بە کارەکە دەدەن تا دەگەنە ترۆپکی کامڵی.

پابەندبوون..

هۆکارەکەش ئەوەیە؛ ئەوان کەسانێکی ئازادن و، بە ئازادی بڕیار لەسەر چارەنووسی مرۆڤ دەدەن. ڕەنگە هەندێکیان ئارەزووی دامەزراندنی سستمی فاشستی بکەن و، ڕەنگە خەڵکەکەی دی بە ڕادەیەک ترسنۆک بن کە چاوپۆشی لەو نەتەوەیە بکەن و لێیان دووربکەونەوە، ئەوکاتەش فاشیزم ئیدی بمانەوێت و نەمانەوێت دەبێتە ڕاستییەکی مرۆیی، چونکە لە واقیعدا شتەکان بەو شێوەیە دەبن، کە مرۆڤ بڕیاری بوونیان لەسەر دەدات. بەڵام ئایا ئەمە مانای پێداویستی ملکەچبوونێک بۆ فەلسەفەیەکی تێرامانکاری ئارام و خۆشنوود دەبەخشێت؟ نەخێر، بەڵکو پێویستە بەر لە هەموو شتێک پابەندبم بە خودی خۆمەوە و، پاشان بە پێی ئەو پەندە دێرینە کاربکەم: " لە گەرمەی کاردا، پێویست بە هیوا ناکات".

ئەمەش ئەو واتایە نابەخشێت کە پێویستە سەر بە هیچ حزبێک لە حزبەکان نەبم، بەڵکو من دەبمە ئەندامێک کە

خەیاڵپلاویم نەبێت و، بە گوێرەی توانای خۆم کاربکەم. ئەگەر بۆ نموونە بپرسم: ئایا دەکرێت چالاکی مرۆیی بە هەموو دەزگاکانیەوە بۆ شێوەی کۆمەڵگەلێک وەربچەرخێت؟ ئایا ئەم گۆڕانەش ڕوودەدات؟ ناتوانم وەڵامی ئەوەش بدەمەوە، ئەوەی بە ڕوونی دەیزانم ئەوەیە؛ هەرچەندی لە توانامدا بێت کار بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجە دەکەم، چونکە ناتوانم بەدەر لە ویست و کاری خۆم ئیشێکی ئەوتۆ بکەم.

بوونگەرایی و فەلسەفەی تێرامانی خامۆش..

فەلسەفەی تێرامانی خامۆش-**Quie'tisme** یان **Silent contemplation** فەلسەی ئەو کەسانەیە کە دەڵێن: لە توانای خەڵکی دیکەدایە ئەو کارە بکەن، کە لە توانای مندا نییە بیکەم. بەڵام ئەو فەلسەفەی بوونگەراییەی کە پێشکەشتانی دەکەم، بە پێچەوانەی ئەو وتەیەوە، ڕایدەگەیەنێت: هیچ واقیعێک لە دەرەوەی کاردا نییە، بگرە لەوە زیاتریش دەڕوات و دەڵێت: مرۆڤ لە پرۆژەی بوونێک زیاتر نییە کە خۆی وێنای دەکات و، بگرە بوونیشی نییە، تەنها بە بڕی ئەوەی خۆی دەهێنێتە دی، کەواتە ئەو (واتە مرۆڤ) لە سەرجەمی کارکردنەکانی خۆی زیاتر چی دیکە نییە، ئەو خودی ژیانی خۆیەتی.



نیازی خراپ..

لێرەدا دەبینین کە چۆن بۆچوونەکەمان ترس لە دڵی هەندێک کەسدا دەچێنێت، ئەوانەی بەرگەی شکستهێنانی خۆیان ناگرن، تەنیا بەو قسەیە نەبێت کە دەڵێن: "بارودۆخەکە دژ یان پێچەوانەی من بوو، هەرچەندە من لەوە باشتر بووم. ڕاستە من لەنێو هاوڕێبەندییەکی مەزندا یان لە ئەوینێکی گەورەدا نەژیاوم، بەڵام هۆکارەکەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە من نە بە پیاوێک یان ژنێک نەگەیشتووم کە شایانی ئەو پەیوەندییە بێت. ئەگەر کتێبێکی باشم نەنووسیبێت، ئەوا لەبەر ئەوەیە کاتم بە دەستەوە نەبووە. ئەگەر مندالم نەبوو‌بێت، لەبەرئەوەیە دوچاری ژنێک نەهاتم، کە بتوانم لەگەڵیدا ژیانێکی هاوبەش پێکەوە بنێم. لەبەرئەوە زنجیرەیەکی زیندوو لە ئامادەگی و مەیل و خۆزگە و ئەگەر و شیاوەکان لە ناخمدا لەکار وەستاون، کە لە خودی خۆیدا بەهایەک دەبەخشێت و ناکرێت لە زنجیرەیەک کردەوەی سادە و ساویلکەی خۆمدا کورتیان بکەمەوە".

بەڵام بەلای ئێمەوە لە ڕاستیدا تاکە بوونێک تەنها بۆ ئەو ئەوینەیە کە خودی خۆی بونیاد دەنێت و، ئەگەری بوونی ئەوینێکیش تەنها ئەوەیە کە خودی خۆی لە خۆشەویستییەکی دیاریکراودا دەردەخات. بلیمەتیش پێ بە پێی گوزارش کردنی خودی خۆی دامەزراوە، کە لەو



بەرهەمــە زیندووانــەدان و بــەجیهان گەیــشتن. بــۆ نموونــە بلیمەتیی مارسیل پرۆست..

**Marcel Proust** بریتییە لە ســەرجەمی نووســراوەکانی، لە هەموو بەرهەمەکانی، هەروەها بلیمەتیی ڕاسین- **Racine** لــە زنجیرەیــەک شــانۆگەرییەکانی زیــاتر چــی دیکــە نییــە و، شــتێک نییــە لــەوە بــەدەر! بــەڵام ئەگــەر بووترێــت: ڕاســین دەتوانێــت شــانۆگەرییەکی نــوا بنووســێت، ئــەوا قــسەیەکی بێمانایە، لەبەرئەوەی ڕاسین ئەو شانۆگەرییەی نەنووسیوە.

کەوابێت مرۆڤ لە ژیانیدا پابەنــدە و دیمــەنێک بــۆ پێگــەی خۆی وێنادەکات، ئیدی هیچ شــتێکی ئــەوتۆ نییــە لــەم وێنەیــە بەدەربێت. پێدەچێت ئەم بیرۆکەیە بۆ ئەو پیاوە ســەخت بێــت کە لە ژیانیدا هیــوا بــڕاو بــووە، بــەڵام زەمینــە بــۆ خەڵکانێک خۆشدەکات کــە لــە بایــەخ و گرنگــی واقیــع خــۆی تێبگــەن و، دەرک بە خەونەکان و چاوەڕوانییــەکان و ئازارەکــان بکــەن، بــەو پێیــەی وەک خــەونێکی شکــست خــوارد و هیوایــەکی هەرەسهێنراو مرۆڤ پێشدەخات، یان وەک پێشبینییەک کــە چ ســوودێکی نییــە، واتــە نێگەتیــڤانە مــرۆڤ پێــشدەخات، نــەک پۆزەتیڤانە.

مرۆڤ و ژیانەکەی یەک شتن..

ئەگەر بڵێین: مرۆڤ و ژیانەکەی یەک شتن، ئەمە ئەو مانایە ناگەیەنێت کە نووسەر تەنیا لە ڕێگەی نووسینەکانیەوە، بڕیاری لەسەر دەدرێت، چونکە چەندین شتی دیکەش هەن کە لە پێناسینیدا بەشدارن. ئەوەی دەمانەوێت بیڵێین ئەوەیە: مرۆڤ لە زنجیرە پڕۆژەیەک زیاتر نییە و، خۆی کۆکراوە و ڕێکخەرەکەیەتی، هەر ئەویش کۆی ئەو پەیوەندییانەیە کە دەیرەخسێنێت.

ڕەشبینی یان دڵڕەقییەکی گەشبین؟

لەم حاڵەتەدا، ئەوەی پێی تاوانبار دەکرێین، بە ڕاستی ڕەشبینی نییە، بەڵکو دڵڕەقییەکی گەشبینە. ئەگەر خەڵکی بە هۆی نووسینی ئەو کورتە چیرۆک و ڕۆمانانەوە گلەییمان لێبکەن کە تیایاندا وەسپی مرۆڤی لاواز و ترسنۆک و بێئیرادە دەکەین، ئەوا چیدی گازەندەمان ناکەن، چونکە ئەوان کەسانێکن، خۆیان ئاوەهان، لەبەرئەوەی ئەگەر ئێمە وەکو (ئەمیل زۆلا) ئەو دارمانە بە کاریگەری ژینگە و کۆمەڵگە شرۆڤە بکەین، یاخود بە کاریگەری هەربوونایەتی/ حەتمیەتی ئەندامی یان دەروونی بێت، ئەوا خەڵکی بە لێکدانەوەکەی ئێمە خۆشنوود دەبوون و، دەیانووت: "ئێمە لێدانێکی ئاوەها توند و قایمیین و کەسیش ناتوانێت شتێک لە ئێمەدا بگۆڕێت".



ترسنۆک خۆی ئاوەها دروستدەکات (چێدەکات)..

کاتێـک بیریـاری بوونگـەرا بـاس لـە پیـاوێکی ترسـنۆک دەکـات، ئـەوا لێپرسـراوێتی ئـەو کەسـە بەرامبـەر خـۆی دەردەخات. ئـەو هۆکـاری ترسـنۆکییەکەی بـۆ فاکتـەرێکی بۆماوەیی دەروونیـی یـان بـایۆلۆژی ناگەڕێنێتـەوە، بەڵـکو جـەخت لـەوە دەکـات کـە بـە هـۆی زنجیرەیـەک لـەو کردەوانەوە پەیدا بووە، کە خۆی بە ئەنجامی گەیاندوون و، بـەو شـێوەیە ترسـنۆکیان کـردووە. بـەلای ئێمـەوە، ئـەوە مەزاجی ترسنۆکی نییە، بەڵکو چەند جۆرێکن لە مـەزاج، کـە بە دەمارگیری یان بە خوێنگـەرمی نـاوزەد دەکـرێن و پێـی دەڵێن ئەو هەژارە یان دەوڵـەمەندە. بـەلام خـاوەن خـوێنی هەژار (خوێنی سارد) هۆکارێک نییە بـۆ ترسـنۆکی، چونکـە ترسـنۆکی کـردەی ملکـەچی و وازلێهێنانـە و، مـەزاجیش کردەیەک نییـە، ترسـنۆکیش پـێ بـە پێـی ئـەو کردەوانـەی دەیکات دەناسرێتەوە.

بەرپرسیارێتی مرۆڤ..

ئـەوەی مـرۆڤ بـە شـێوەیەکی تەڵـخ و نادیـار هەسـتی پێدەکات و، هەروەها ئەوەی قێزەونی دەکات ئەوەیە؛ ئێمـە ئـــەو ترســـنۆکە بەرامبـــەر خراپییەکـــەی خـــۆی بەرپرســـیاردەکەین، ئـــەوان دەیانـــەوێت مـــرۆڤ بـــە

پاڵەوانییەتی یان بەترسنۆکی لەدایک ببێت، لەم بارەیەشەوە لـە سـەر کتێبەکـەمان (ڕێچکـەکانی ئـازادی- **Chemins delalibert’eles** یـان **lins Freedom**) گازەنـدەمان دەکەن.

ئـەویش ئەوەیـە؛ ئێمـە چـۆن دەتـوانین ئـەو ترسـنۆکانە بکەینە کەسانێکی پاڵـەوان؟ ئەگـەرچی ئـەم ڕەخنـە قۆشمـە ئامێزە ئەوە بەسـەر خەڵکدا دەسـەپێنێت، کـە پاڵـەوان بـن لەگەڵ لەدایکبوونیاندا. خەڵکی لـە نـاخی خۆیانـدا بـیر لەمـە دەکەنەوە و دەڵێن: "ئەگەر بە ترسنۆکی لەدایک بیـت، ئـەوا بێخەم دەبیت، چونکە تۆ ناتوانیت هیچ شتێک بکەیت، بەڵـکو بــە درێژایــی ژیانــت، هــەر بــەو شــێوەیە دەمێنیتــەوە، هەرچەندێکیش هەوڵ بدەیت. ئەگەر بـە پاڵـەوانیش لـەدایک بیت، هەروەها بێخەم دەبیت و بە درێژایی ژیانت هـەر بـەو شێوەیە دمێنیتەوە، هەرچەندێکیش هەوڵ بدەیت، هـەروەک پاڵەوانەکان دەخۆیت و دەخۆیتەوە".

بەڵام هەرچی بوونگەرا دەیڵێت ئەوەیـە؛ ترسـنۆک خـۆی خۆی دروسـتدەکات، پاڵـەوانیش هـەروەکو ئـەو، ترسـنۆک دەتوانێـت لـە حاڵـەتی ترسـنۆکییەکەی لابـدات، هـەروەها پاڵەوانیش دەتوانێت واز لە پاڵەوانییەتییەکەی خۆی بهێنێت. ئەوەی لـەم تێـزەدا گرنگـە ئەوەیـە؛ پابەنـدبوون هەمـەلایی

بێت. بەڵگەنەویستیشە کە پابەندبوون لـە ئـەنجامی کـردەی تایبەت یان حاڵەتێکی تایبەتییەوە، هەمەلایی نابێت.

مەسەلەی خودگەرایی..

تا ئێستا وەڵامی ژمارەیـەک لـەو ڕەخنانـەمان دایـەوە کـە ئاراســـتەی بوونگـــەرایی دەکـــرێن. لـــە وەڵامەکانیـــشەوە ڕووندەبێتەوە؛ ناتوانین بوونگەرایی بـە فەلـسەفەی بێـدەنگی (خامۆشی) و تێڕامان ناوزەد بکەین، لەبەرئـەوەی مـرۆڤ بـە کارکردن دەناسرێتەوە، هەروەها بوونگـەرایی دیدەنیگایـەکی ڕەشبینی نییە، لەبەرئەوەی چارەنووسی مرۆڤ دەخاتـە نێـو دەستی مرۆڤەوە و، بـەو جـۆرەش لـە زۆربـەی تیۆرییـەکان ڕوونبین و گەشبین ترە، پاشان بوونگەرایی هەوڵێک نییـە بـۆ تەگەرە خستنە هیممەتی مرۆڤەوە لە کارکردندا، لەبەرئـەوەی هـیچ هیوایـەک لـە مرۆڤـدا بـەدی ناکـات، تـەنها لـە خـودی کارەکەیدا نەبێت، کارکردن تاکە شـتێکە کـە بـواری ژیـان بـۆ مـرۆڤ دەرەخـسێنێت، کەواتـە ئێمـە و، لەسـەر ئـەم ئاسـتە، لەبەردەم ئاکاری کارکردن و پابەند بووندایین.

خودگەرایی..

نـــەیارانمان هـــەر بـــەو ڕەخنانـــەوە ناوەســـتنەوە کـــە ڕووبەڕوومان دەکەنەوە، بەڵـکو هـەروەها بـە پێـی هەنـدێک



ڕاگەیەنراو، بەوە تۆمەتبارمان دەکەن کە؛ ئێمە مرۆڤ لە خودگەراییە تاکەکەیدا گەمارۆ دەدەین، ئەوان بەو لێکدانەوەشیان لێمان تێناگەن. ئەگەر خودگەرایی خاڵی دەستپێکی ئێمە بێت، ئەوا لەبەر هۆکاری پوختی فەلسەفییە، نەک لەبەرئەوەی ئێمە بۆرژواز بین، ئێمە تیۆرییەکمان دەوێت کە پشتی بە ڕاستی بەستبێت، نەک کۆمەڵێک تیۆری جوان، کە جمەیان دێت بە ئاوات و هیوا و بناغەی واقیعی تیایدا پێکدادەدەن.

(کۆژیتۆ)..

ناکرێت لە پێشدا ڕاستیەک هەبێت، جگە لە ڕاستی کۆژیتۆ: من بیردەکەمەوە، کەوابێت من هەم. ئەمەش ڕاستییەکی ڕەهای ئەو ئاگاییەیە کە دەرک بە خودی خۆی دەکات، چونکە هەموو ئەو تیۆرییانەی باس لە مرۆڤ دەکەن، لە دەرەوەی ئەو قۆناغەدا کە تیایدا دەرک بە خودی خۆی دەکات، ئەوە تیۆرییەکە، کە ڕاستی بەلاوە دەنێت و فەنای دەکات، لەبەرئەوەی شتە شیاوییەکان لە دەرەوەی کۆژیتۆدان. هەموو ئەو تیۆرییانەش کە لەسەر شیاوەکان (ئەگەرەکان) بونیاد دەنرێن و، بە ڕاستییەکەوە نەبەستراونەتەوە، تیۆرییەکە لە نەبووندا (عەدەمدا) دەکەونە خوارێ، لەبەرئەوەی پێناسی شیاو پێویستی بە زانینی



ڕاستی هەیە. بوونی هیچ ڕاستییەک لە ئارادا نییە، تەنها بە بوونی ڕاستییەکی ڕەهاوە نەبێت، ئەمەش ئەو ڕاستییەیە کە خەڵکی لە سادەیی و ئاسانییەکەیدا مامەڵەی لەتەکدا دەکەن و، ئەوەش ڕاستەوخۆ دەرکپێکردنی مرۆڤە بە خودی خۆی، بەبێ هیچ گرێ و گۆڵێک.

بوونگەرایی و ماتریالیزم..

بوونگەرایی لە لایەکی دیکەوە، تاکە تیۆرییەکی کەم وێنەیە (ناوازەیە) کە شکۆمەندی و کەرامەت بە مرۆڤ دەبەخشێت و نایکاتە شتێک لە شتەکان. هەموو تێڕوانینێکی ماتەریالی ئەوەی لێ پەیدا دەبێت کە؛ مرۆڤ بە شتێک لە شتەکانی جیهان دادەنێت، واتە بە کۆی کاردانەوەی دیاریکراوی دادەنێت و، هیچ جیاوازییەک لە نێوان ئەو و سەرتاپای چۆنیەتیەکان و دیاردەکاندا ناکات، کە ڕەنگە مێزێک یان کورسییەک، یاخود بەردێک بێت. بەڵام ئێمەی بوونگەرایی دەمانەوێت جیهانی مرۆیی بە کۆی بەهاو نۆرمی جیاکار پێکبهێنین کە لە جیهانی ماتەری جیاوازە. ئەو خودگەراییەش کە دەیگەینێ، خودگەرایی تاکگەرا نییە، لەبەرئەوەی مرۆڤ، وەک خستمانەڕوو، بە هۆی کۆژیتۆوە خودی خۆی دەدۆزێتەوە و، هەروەها خودی ئەوانی دیکەش دەدۆزێتەوە. ئێمە بە پێچەوانەی فەلسەفەی (دیکارت) یان فەلسەفەی



(کانت)ەوە، لەو بڕوایەداین کۆژیتۆ وامان لێدەکات بەرامبەر بە مرۆڤێکی دیکە دەرک بە خودی خۆمان بکەین، دەرک بەوەش بکەین کە بوونی ئەویش بەرامبەری ئێمە، بوونێکی ڕاشکاوە هەروەکو بوونی ئێمە.

بوونی ئەوانی دیکە..

ئەو مرۆڤەی بە کۆژیتۆ دەرک بە خودی خۆی دەکات، هەروەها دەرک بە بوونی کەسانی دیکەش دەکات و دەیاندۆزێتەوە بە پێودانگی مەرجدارێتی بوونی خودی خۆی، ئەو شتێکی ئەوتۆ نییە ئەگەر ئەوانی دیکەش دانی پێدانەهێنن (نەک تەنها ئێسک سووکی یان ڕەزاگرانی، یاخود خراپییەکەی یان پیاوچاکییەکەی). ئەگەر ڕاستییەکیش فرێ بدەم کە بە خودی خۆمەوە بەستراوە، ئەوا بە هۆی ئەوی دیکەوە نەبێت، چنگم ناکەوێتەوە و نایدۆزمەوە، چونکە ئەوی دیکە نەک تەنیا مەرجێکە بۆ بوونی من، بەڵکو مەرجی ئەو زانینەش کە سەبارەت بە خودی خۆم بونیادی دەنێم.

بەم جۆرە دۆزینەوەی ناواخنی خۆم لەم مەرجانەدا، دەبێتە دۆزینەوەیەک بۆ ئەوی دیکە، بەوپێیەی ئەو ئازادییەکە و خراوەتە بەردەمم و، بەوپێیەی ئەو لە بیرکردنەوە و داخوازییەکانی دەربارەی من، یان بە چاکی یان بە خراپی چەقدەبەستێت. دەرەنجامی ئەوەش بریتییە لە: ئێمە

جیهانێکمان دۆزیوەتەوە، پێی دەڵێین جیهانی خودگەرایی ئاڵووگۆڕ- **Subjectivit’e-inter** یان **alternate subjectiv**، ئەویش جیهانێکە مرۆڤ تیایدا بڕیار لەسەر بوونی خۆی و هەروەها بوونی ئەوانی دیکەش دەدات.

باروودۆخی مرۆڤ..

ئەگەر مەحاڵ بێت چییەتی گەردوونیی لە مرۆڤدا بدۆزینەوە، کە سروشتی مرۆڤ خۆیەتی، ئەوا ئەو مانایە نابەخشێت کە لە ڕووی باروودۆخی مرۆڤەوە- **Humanine condition** گەردوونیی مرۆیی تیادا بەدی ناکرێت. شتێکی ڕێکەوت نییە کە بیریاران لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا باس لە باروودۆخی مرۆڤ دەکەن، لەبری ئەوەی وتووێژ دەربارەی سروشتی مرۆڤ سازبدەن، مەبەستی ئەوان لەو باروودۆخەش بە ڕوونی ئەوەیە؛ هەموو سنوورە پێشینەییەکانە- **apriori** کە دەوری باروودۆخە بنەڕەتییەکانی مرۆڤیان داوە لە جیهاندا.

باروودۆخی مرۆڤ و دۆخە مێژووییەکەی..

باروودۆخە مێژوو ییەکان، باروودۆخێکی گۆڕراون. ڕەنگە مرۆڤ لە کۆمەڵگەیەکی بت پەرستدا بە کۆیلەیی لەدایک ببێت، یاخود ئاغایەکی دەرەبەگ بێت، یان کرێکارێکی زەحمەتکێش



بێت، بەڵام ئەو شتەی کە ناگۆڕێت؛ پێویستی بوونی مرۆڤە لە جیهاندا، بوونی لە کارکردنیدا لەگەڵ کەسانی دی، بوونێک کە کۆتاییەکەی مردنە، ئەو سنوورەش کە پێشتر باسم کرد, سنوورێکی بابەتی یان خودگەری نییە، بەڵکو بە مانایەکی دی ڕوویەکی بابەتییە و ڕووەکەی دیکەشی خودگەرییە. بوونەکە بابەتییە، لەبەرئەوەی ئێمە لە هەموو شوێنێکدا دەیبینین و دەیناسین. خودگەریشە، لەبەرئەوەی لە ناواخنی ژیانی مرۆڤدایە، ئەو شتێک نییە ئەگەر مرۆڤ تیایدا نەژی، لە ڕووی دیاریکردنی خۆی لە بووندا، کە سەبارەت بە سنوورەکە دیاریکردنێکی ئازاد دەبێت.

گەردوونیی پرۆژەی تاکگەرا..

لەبەرئەوەی دەکرێت پرۆژەکان هەژماردبن، بە لایەنی کەمەوە تاکە پرۆژەیەکیان بە نیسبەت منەوە تەواو نامۆ نییە، لەبەرئەوەی هەمووی هەر ئەوە دەخاتە بەردەمم کە هەوڵێک بێت بۆ تێپەڕاندنی ئەو سنوورە، یان بۆ دوورخستنەوەی، یان بۆ لابردنی، یاخود بۆ خۆگونجاندن لەگەڵیدا. کەواتە هەموو پرۆژەیەک، هەرچەندێکیش تاکگەرا بێت، خاوەنی بەهایەکی گەردوونییە. پیاوێکی ئەورووپی دەتوانێت لەو پرۆژەیە تێبگات کە مرۆڤێک لە چین یان لە هیندستان وێنای دەکات. ئەو بە هەمان ڕێگە دەتوانێت لە بارودۆخێکەوە، کە



ئەو وێنای دەکات، بگوازێتەوە بۆ سنوورێک کە خودگەریی هەیە، واتە ئەو لە خودی خۆیدا وێنایەکی نوێ بۆ پڕۆژەی پیاوە چینییەکە دەکات و لە خۆشی دەگرێت. هەموو پڕۆژەیەکی گەردوونیی توانستی ئەوەی هەیە هەموو مرۆڤێک لێی تێبگات، بەڵام ئەمەش ئەوە نابەخشێت ئەو پڕۆژەیە بە شێوەیەکی هەمیشەیی مرۆڤ دەناسێنێت، بەڵکو دەکرێت سەرلەنوێ ئەو پڕۆژەیە بخرێتەوە ژێر باس. بۆ نموونە؛ ئەگەر بۆ ئەوەش زانیاری پێویست لەبەردەستدا بێت، شێوازێکی دیاریکراو بۆ تێگەیشتن لە منداڵ و پیاوێکی ناژیاریيو پیاوێکی شێت هەیە.

گەردوونیی مرۆڤ..

بەم شێوەیە دەتوانین بڵێین: گەردوونیی لە مرۆڤدا هەیە، بەڵام گەردوونییەک نا کە پێمان بەخشرابێت، بەڵکو بە شێوەیەکی بەردەوام لەلایەن خۆمانەوە بونیاد دەنرێت. من بە هەڵبژاردنی خودی خۆم، هەرچییەکی گەردوونییە چێی دەکەم (لە خۆمی دەگرم)، بە پێی تێگەیشتنم لە پڕۆژەی هەموو مرۆڤێکی دیکە، لەهەر سەردەمێکدا بێت، بونیادی دەکەم. ئێمە لێرەدا لە بەردەم هەڵبژاردنی ڕەهادایین، کە ڕێژەیی هەر سەردەمێک لە سەردەمەکان ناسڕێتەوە. ئەوەی بوونگەراییش دەیەوێت بیخاتەڕوو، بریتییە لەو پەیوەندییەی



که له نێوان سیفەتی ڕەهای پابەندبوونی ئازاد-دایە، کە بە هۆیەوە مرۆڤ خۆی دەهێنێتەدی، بە هێنانەدی نموونەیەک لە نموونە مرۆییەکان، ئەو پابەندییەش هەموو مرۆڤێک و لەهەر سەردەمێکدا بێت تێیدەگات. لەگەڵ ڕێژەیی کۆمەڵەی ڕۆشنبیریدا، کە دەکرێت لەو هەڵبژاردنەوە بەرهەم بێت، بۆ نموونە: ڕێژەیی لە قوتابخانەی دیکارتیزمدا هەیە و، ڕەهاییش لە پابەندبوونی دیکارتیدا.

بەم مانایە، ئەگەر بتانەوێت دەتوانین بڵێین؛ هەریەکێک لە ئێمە (بۆ نموونە) لە کاتی هەناسەداندا یان نانخواردنیدا، یاخود لە کاتی خەوتندا یان نواندنی هەر ڕەفتارێکیدا، بە شێوەیەک لە شێوەکان ڕەهاییەک بونیاد دەنێت. جیاوازی نییە لە نێوان ئەوەی مرۆڤ لەسەر شێوەیەکی ئازاد-دا بێت یان لە نێوان ئەوەی پڕۆژەی بوونێکە، یان بوونێکە کە بۆ چییەتی مرۆڤ هەڵبژێردراوە، یاخود بوونەوەرێکی ڕەها بێت. هەروەها جیاوازی نییە لە نێوان ئەوەی مرۆڤ بوونێکی ڕەها یان دیاریکراوی هەبێت، بە شێوەیەکی کاتی لە شوێنێکدا، واتە لە مێژوودا دیاریکراو بێت، یاخود لەنێو ئەوەی بابەتێکی گەردوونیی بێت بۆ تێگەیشتن.

هەڵبژاردن و خودگەرایی..



ئەوەی تا ئێستا وتمان، وەلامێکی تەواوی ئەو ڕەخنەیە ناداتەوە کە بوونگەرایی بە ڕەوتێکی (مەیلێکی) خودگەرایی زیادەڕۆ تۆمەتبار دەکات. شێوەکانی ئەم ڕەخنەیە فرەن، یەکەمیان ئەوەیە کە دەڵێن: "دەتوانن چیتان دەوێت بیکەن"، ئەوان بە ڕێگەی جیاواز ئەم شێوەیە دەردەبڕن، یەکەم شت بە (ئاژاوە) تاوانبارمان دەکەن، هەروەها ئەوە ڕادەگەیەنن کە ئێمە ناتوانین بڕیار لەسەر کەسانی دیکە بدەین، لەبەرئەوە هیچ هۆیەک نییە کە بە پەسەندتر دابنرێت وبەسەر ئەوی دیکەدا بسەپێنرێت، پاشان لە کۆتاییدا پێمان دەڵێن: هەرچییەکی دەیبەخشن بە خۆڕاییە، بگرە پێدەچێت هەرچییەکی بە دەستێک دەیبەخشن، بە دەستەکەی دیکە وەریدەگرنەوە.

هەڵبژاردن و بارودۆخی مرۆڤ..

هەرچەندە ئەو ڕەخنانە بە جیدی نین. ئەو ڕەخنەیەی تاوانبارمان دەکات بە ئەوەی ئێمە ناتوانین هیچ شتێک هەڵبژێرین، ڕەخنەیەکی ڕاست نییە. هەڵبژاردن لە ڕوویەکی دیاریکراوەوە دەکرێت، بەلام مەحاڵ لە نەکردنی هەڵبژاردندایە. من بەردەوام دەتوانم هەڵبژێرم، ئەگەرچی پێویستە ئەوەش بزانم کە هەڵنەبژاردنیشم لە خودی خۆیدا جۆرێکە لە هەڵبژاردن. ئەم خاڵە، سەرەڕای فۆڕمە

ڕووکەشییەکەی، بۆ دانانی سنوورێک پێویستە لە بەرامبەری حـەز و ئـارەزووودا دابنرێـت، ئەگـەر وا پێویـستیش بکـات هەڵوێستێک هەڵبژێرم و بەرپرسیاریش بم لێـی، لەبەرئـەوەی منیش و کەسانی دیکەش لەگەڵـمدا پێویـستیان پێیـەتی، ئـەوا حەز و ئارەزوو هیچ پەیوەندییەکی بەو هەڵـبژاردنەی منـەوە نییـە، تەنانـەت ئەگـەر هـیچ پەیوەندییـەک لـە نێـوان ئـەو هەڵبژاردنە و هەر دابونەریتێکی پێشینەییدا نەبێت. بۆ نموونە؛ بوونی من لە حاڵـەتێکی دیاریکراودایـە، لەبەرئـەوەی مـن لـە ڕەگەزێکی دیاریکراوم و دەتـوانم لەگـەڵ ژنێکـدا یـەکبگرم و منداڵـم لێـی ببێـت، هـەموو ئەمانەشـن کـە بـۆ هەڵـبژاردن بانگهێشتم دەکەن.

هەڵبژاردن و کردەی خۆڕایی لای (جید)..

ڕەنگە وابزانرێت کە ئێمە لێرەدا گەیشتینە تیـۆری ئەندریـە جید- **A. Gide** لە کردەی خۆڕاییدا[6]. بەڵام جیاوازی نێـوان هەردوو تیۆرییەکە جیاوازییەکی زۆر گەورەیە. لەبەر ئەوەی ئەندریـە جیـد چییـەتی دۆخـی مرۆیـی **Situation di I'homme** نازانێت، بەڵکو بە پێی خواستی خۆی کاردەکـات، بەڵام ئێمـە لـەو بڕوایـەداین؛ مـرۆڤ ڕۆچۆتـە نێـو دۆخێکـی ڕێکخـراوەوە، کەواتـە مـرۆڤ لەگـەڵ هـەموو مرۆڤـایەتیدا پابەنـدە و بـە هـیچ جۆرێـک ناتوانێـت لـە هەڵـبژاردن دوور



بکەویتەوە. بۆ نموونە: یان دەبێت مرۆڤ بە پاکی بمێنێتەوە، یان دەبێت ژن بهێنێت، ئەوکاتەش خێزانەکەی یان ئەوەتا چەندین منداڵی تێدایە، یاخود وەجاخ کوێرە، بەهەرحاڵ ئەو سەبارەت بەو کێشەیە لە پابەندبوون زیاتر، توانای چی دیکەی نییە. ڕەنگە مرۆڤ بەبێ ئەوەی هانا بۆ ئەو دابونەریتانە بەرێت کە پێشتر دانراوە، کردەی هەڵبژاردن بڕەخسێنێت، بەڵام ئەوەش ناگەیەنێت کە بە گوێرەی خواستی خۆی ڕەفتار دەنوێنێت، بەڵکو پێویستە لەسەرمان هەڵبژاردنی ئاکاریی بە بنیادنانی کاریگەرییەک لە کاریگەرییە زۆر و زەوەندەکان بچووێنین.

ئاکار و ئیستاتیکا..

لێرەدا، لەسەر ئاگادار کردنەوەی ئەو ڕادە دەوەستین کە؛ ئێمە لەبەردەم (ئاکاری ئیستاتیکا- **Morale esth’etique** یان **moral Aesthetic**)دا نین، تەنانەت دوژمنە نیازبەدەکانمان بەوە تاوانبارمان دەکەن؛ وەلی ئەو نموونانەی کە هەڵم بژاردن تەنیا بۆ لێکچوواندنە. ئێستاش با پێکەوە بپرسین: ئایا هونەرمەندێک هەیە تابلۆیەکی کێشابێت و خەڵکی گلەییان لێکردبێت کە پێ بە پێی ئەو ڕێسایانەی نەکردبێت کە پێشتر دانراون؟ ئایا هیچ جارێک وتوویانە ئەو تابلۆیە چییە کە پێویستە دروست بکرێت؟ بەڵگەنەویستە، لە



تێـڕوانینی ئێمــەدا ئـەو تـابلۆ دیـاریکراوە بـوونی نییــە کـە ئامادەکرابێت بۆ دروستکردن، بەڵـکو هونەرمەنـد دەسـت بـە بنیادنانی تابلۆکەی دەکات و ئەو تابلۆیەی پێویستە دروسـتی بکات ئەوەیە کە بە ڕاستی دروسـتی دەکـات. بەڵگەنەویـستە، کە بەهای جوانی پێشینەیی هیچ تابلۆیەکیش هەروەها بوونی بـۆ نییــە، واتــە دانرابێــت پــێش ئــەوەی لەســەر دەسـتی هونەرمەندێک بە ئەنجام بگەیەنرێت، بەڵکو بەهایەک هەیە کـە لـە سـەروو ئـەوەوە دەبینرێـت، لـە یـەکگرتوویيو تۆکمـەیی ناوەوەی تابلۆکە، لە لایەکەوە لەو پەیوەندییانەی لـە ویـستی ئافەریـدەکردنی هونەرمەندایـە و، لـە لایـەکی دیکەشـەوە لـە نێوان ئاکامی خوڵقاندنەکە هەستی پێدەکەین. لەبەرئەوە کەس ناتوانێـت بـڕیار لەسـەر ئایندەی هونـەری وێنـەگرتن بـدات، لەبەرئەوەی بـۆ نموونـە؛ بـڕیار لەسـەر هونەرەکـە نادرێـت، تەنها دوای خەملاندن و سازدانی نەبێت.

بەڵام ئەوە چ پەیوەندییەکی بە ئاکارەوە هەیـە؟ وەڵامـیش ئەوەیـە: ئێمـە لـە بـواری ئاکارییـدا لــە دۆخـی داهێنــەرێکی هاوشێوەدا دەبین. ئێمە هەرگیز باس لـە خـۆڕایی کاریگـەری هونەریی ناکەین، بـۆ نموونـە؛ ئەگـەر باسمـان لـە تابلۆیـەکی بیکاسـۆ- **Picasso** کـرد، بـە کردەیـەکی خـۆڕایی نـاوزەدی ناکەین، بەڵکو باش دەرک بەوە دەکەین کە بیکاسـۆ لـە کـاتی بە ئەنجامدانی کـارە هونەرییەکەیـدا، خـودی خـۆی بوونیـاد



ناوه و سەرجەمی تابلۆکانیشی بە خودی ژیانی خۆیەوە تێکەڵکێش بووە.

ئاکاری بوونگەرایی..

ئەوەی دەربارەی داهێنانی هونەری وتمان، بەسەر ئاکاریشدا دەسەپێت، قەدەری هاوبەشی نێوان هونەرو ئاکار ئەوەیە؛ ئێمە لە هەردوو بارەکەدا لە بەردەم داهێنان و ئەفراندندا بین، تاوەکو لە ئاستی ئەو وزەیە دەربچێت، کە لە پێشینەییدا دیاریکراوە و ئەوەی پێویستە بکرێت. هەست دەکەم ئەوەشم بە شێوەیەکی ئەوتۆ خستەڕوو، کاتێک باسی ئەو خوێندکارەم بۆ کردن کە بۆ ڕاوێژپێکردن هاتە لام، ئەو لاوەی کە دەیتوانی ڕوو لە هەموو مەوداکانی ئاکار بکات، لە کانتیزم و مەسیحیەت و لەو شێوەیە، بەڵام لە کۆتاییدا ناچار بوو خۆی یاسای خۆی دابهێنێت. ئەگەر ئەو لاوە لەگەڵ دایکیدا بمایاتەوە و هەست و سۆزی بکردایەتە بنەڕەتێکی ئاکاریی، یاخود ئەگەر بچووایەتە ڕیزی تێکۆشەرانەوە و لەژێر کاریگەری خۆبەختکردندا دەبوو، ئەوا ئێمە پێی نالێین ئەو لاوە هەڵبژاردنێکی بێنرخی بە ئەنجام گەیاندووە.

مرۆڤ خۆی چاکە و جوامێری (ئاکاری جوانی) خۆی هەڵدەبژێرێت..



مـــرۆڤ خـــۆی بنیـــاد دەنێـــت و، ئـــەو لـــە ســـەرەتاوە پێکنەهاتووە، بەڵکو پێویستە لەسەری چاکە و جوامێری خۆی هەڵبژێرێت، چونکە فشاری بـارودۆخ ڕێگـەی هەڵـنەبژاردنی پێنـادات. ئێمـە پێناسـی مـرۆڤ ناکـەین، تـەنیا سـەبارەت بـە پابەندبوونێکەوە نەبێت، لەبەرئەوە شتێکی بێهوودەیە کـە بـە بێبەهایی و هەڵبژاردن تاوانبار بکرێین.

هەرچی شێوەی دووەمی ڕەخنەکەیان دەربارەی مـەیل و خواستی تاکگەراییمان، ئەوەیە کە پێمان دەڵێن: ئێوە نـاتوانن بڕیار بەسـەر کەسـانی دیکـەدا بـدەن. ئـەم وتەیـە ڕاسـتە و هەڵەشە، ڕاسـتە بـەو مانایـەی کاتێـک مـرۆڤ پابەنـدبوون و پڕۆژەی خۆی بە شـێوەیەکی ڕوون و ڕاسـت هەڵـدەبژێرین، ناتوانێت پڕۆژەیەکی دیکە لە پڕۆژە بنەڕەتییەکـەی خـۆی بـە باشـتر دابنێـت، ئیـدی سروشـتی ئـەو پـڕۆژە بنەڕەتییـە هەرچۆنێک بێت، هەروەها وتەکـە ڕاسـتە، لەبەرئـەوەی ئێمـە بڕوامان بە پێشکەوتن نییە، پێشکەوتن لە دیـدی ئێمـەدا تـەنیا باشـتر بوونــە، مرۆڤــیش لــەژێر بــارودۆخێکی گــۆڕڕاودا ناگۆڕێــت، هــەروەها هەڵــبژاردنی بــۆ خــۆی لــە هــەموو بارودۆخێکـدا، هــەر بــە هەڵــبژاردن دەمێنێتــەوە. مەســەلەی ئاکاریی، هەر لە ڕۆژگارەکانی جەنگی ناوخۆیی ئەمریکییـەوە نــەگۆڕاوە، بــۆ نموونــە؛ ئەوکاتــە دەتــوانرا لایــەنگرانی بــە کۆیلەکردن یان نەیارەکانیان هەڵبژێردرێن، تا ئەم ڕۆژگارەی



ئەمڕۆ کە هێشتا دەتوانرێت حزبی مەسیحی یان دیموکراتی یاخود حزبی کۆمۆنیستی هەڵبژێردرێت.

هەڵبژاردنی خود بە لایەن ئەوانی دیکەوە..

دەشێت لە لایەکی دیکەوە، فەرمایشت بەسەر کەسانی دیکەدا بدرێت، لەبەرئەوەی وەک پێشتر وتمان؛ مرۆڤ بەرامبەر کەسانی دیکە هەڵدەبژێرێت، هەروەک چۆن بەرامبەر بە ئەوان خۆی هەڵدەبژێرێت، دەتوانین بڕیار بدەین، یەکەم: ئەگەر هەڵبژاردنەکە لەسەر ڕاست یان هەڵە بنیاد نرابێت، ئەمەش بڕیارێکی لۆژیکییە. هەروەها دەتوانین بێ سێ و دوو کردن بڕیار بدەین لە نیازخراپیی کەسێکدا ئەگەر؛ هەرکەسێک بە پێی ئارەزووەکانی جوولایەوە یان هەر (حەتمییەتێکی) هەر بوونایەتییەکی دیاریکراوی دۆزییەوە، ئەوە کەسێکی نیازخراپ بێت، ئەویش لەبەرئەوەی ئێمە بارودۆخی مرۆڤمان بەوە دیاری کرد، ئەوە هەڵبژاردنێکی ئازادە، بەبێ هیچ پاساو و هیچ هاریکارییەک.

نیازخراپیی..

ڕەنگە بەرهەڵستکارێک بڵێت: ناکرێت مرۆڤ بە نیازخراپیی خۆی هەڵبژێرێت؟ لە وەڵامدا دەڵێین: پێویست نییە لە ڕووی ئاکارییەوە بڕیاری لەسەر بدەم، بەڵکو هێندەم بەسە کە

نیازخراپییەکەی لەوەدا دیاری بکەم کە هەڵەیە. ناتوانم لێرەدا بـڕیارێکی لۆژیکییانـە بـژار بکـەم، لەبەرئـەوەی نیـازخراپیی جۆرێکە لە درۆ و، ئازادی پابەنـدبوونی تـەواو دەسـڕێتەوە. ئەوەش دەڵێم لە هەمان ئاستدا کە؛ ڕاگەیانـدنم بـە هـەبوونی دابونەریتی پێشتری خۆم بریتییە لـە نیـازخراپیی، سـەرەڕای ئەوەی ناکۆکی هەیە لە نێوان ویـستی خۆمـدا بەرامبـەر بـەو دابونەریت و نۆرمانە لە لایەکەوە و، وتنی ئەوەی کە پێش من کەوتووە لە لایەکی دیکەوە. ئەگەر یەکێکیش پێم بڵێت: ئەگـەر بمەوێت نیازخراپ بم، ئەوا چی دەبێت؟ ئەو دەمەش وەڵامـی دەدەمەوە و دەڵێم: پێویست ناکات نیازخراپ بیت. بگرە پێـی دەڵێم: کە ئەو نیاخراپە و هەڵوێـستی یـەکگرتوویی نـاوەوەی خۆشی لـە وردبوونـەوەی ئـەو هەڵوێـستەدایە کـە نیازپـاکی تێدایە.

ئازادی:

لە لایەکی دیکەوە، دەتوانم بە بـڕیارێکی ئاکارییـەوە قسە بکەم، وەک ئەوەی بۆ نموونە؛ بڵێم: ئازادی لە ڕێگەی هـەموو دۆخێکی بەرچاوەوە چ ئامانجێکی ئەوتۆی نییـە، لـەوە زیـاتر کە خۆی بخوازێت. خۆ ئەگـەر مـرۆڤ جارێـک دانی بـەوەدا هێنا کە ئەو خۆی نۆرم و دابونەریتی داناوە، ئـەوا لـە شـوێنە بەجێهێڵراوەکەیدا، واتە هەسـتکردنی بـە ئـەوەی جێهێـڵراوە،



توانای هیچ شتێکی نابێت، لەوە زیاتر کە دروشمی ئازادی بەرزبکاتەوە و، بیکاتە بنەڕەتێک بۆ ئەو دابونەریتانە. ئەمەش بە مانای ئەوە نایەت کە ئەو ئازادی لە بوارێکی ڕووتدا دەوێت، بەڵکو دوا مانای کردەوەی ئەو کەسانەی نیازێکی چاکیان (پاکیان) هەیە، بریتییە لە ویستنی ئازادی، لەو پێودانگەوەی کە ئازادییە.

هەرکەسێک کە دەچێتە نێو جفاتی کۆمۆنیستییەوە، یان شۆڕشگێڕییەوە، بێگومان ئامانجی بەرچاوی دەوێت، تەنانەت ئەگەر ئەو ئامانجانە بوونی ویستێکی ڕووت بەسەر ئازادیدا بسەپێنێت، چونکە ئازادی لە خۆیدا، لە بواری بەرچاویدا ویستراوە. ئێمە لە پێناو ئازادی خۆیدا داوای ئازادی دەکەین و، لە ڕێگەی هەموو دۆخێکی دیاریکراوەوە داوای ئازادی دەکەین، بگرە ئێمە لە داواکردنی ئازادیدا، تێبینی ئەوە دەکەین کە ئازادیمان تەواو بە ئازادی کەسانی دیکەوە بەستراوە، هەروەکو چۆن ئازادی کەسانی دیکەش بە ئازادی ئێمەوە بەستراوەتەوە.

ئازادی کەسانی دیکە..

ئازادی لەو ڕووەوە کە پێناسەیەکە بۆ مرۆڤ، بە ئازادی کەسانی دیکەوە نەبەستراوەتەوە، بەڵام پابەندبوون، خۆی لە خۆیدا ئەوەم بەسەردا دەسەپێنێت کە ئازادی خۆم و ئازادی



کەسانی دیکەش لە یەک کاتدا هەڵبژێرم، ئەمەش وام لێناکات کە ئازادی خۆم بەو ئامانجە دابنێم کە لەسەر بناغەی ئازادی ئەوانی دیکە دەستەبەر بێت. واتە بە بێئەوەی لەو ئامانجەدا ئازادی کەسانی دیکەش تێکەڵی ئازادییەکەی خۆم نەکەم.

دڵسۆزی..

لە ئامانجی ئەوەدا و، کاتێک ئێمە لەسەر ئاستی دڵسۆزییەکی تەواوەوە بڕیار دەدەین؛ مرۆڤ بوونەوەرێکە، بوونەکەی پێش چییەتییەکەی خۆی کەوتووە و، لە بارودۆخە جیاوازەکاندا توانای لەوە زیاتر نییە کە داخوازی ئازادی خۆی بێت، ئەوا ئێمە لە هەمان کاتدا بڕیار دەدەین؛ ئەو توانای لەوە بەدەرنییە کە ئازادی کەسانی دیکەی دەوێت، بەمجۆرە ئێمە بە ناوی ئەم ویستی ئازادییەوە (ارادە الحریە)، کە لە ناواخنی خودی ئازادیدایە، دەتوانین کۆمەڵێک بڕیار پێکبهێنین و لەسەر ئەوانەی دەربکەین کە دەیانەوێت سروشتییەتی تەواوی بوونیان و سەرتاپای ئازادییەکەی بسڕنەوە.

ئەو کەسانەی سەرتاپای ئازادییەکەیان بە گیانێکی جیدی ساختەوە بسڕنەوە، یان ئەو هۆکارانە بهێننەوە کە بۆ هەر بوونایەتی دەگەڕێنەوە، ئێمە بە ترسنۆک لە قەڵەمیان دەدەین بەڵام ئەو کەسانەی هەوڵ دەدەن پێویستی بوونە لاوەکییەکەی خۆیان وەدەرخەن، ئەوانەی کەسانێکن کە



لەسەر زەوی بەدەرکەوتوون و لەسەر زەوی ژیاون، ئەوا بەو کەسانە دەڵێین ڕیسوا (ساختەچی)، هەردوو جۆرەکەش لەسەر ئاستی دڵسۆزییەکی ڕەوا نەبێت، بڕیاریان لەسەر نادرێت.

ئاکاری پوخت و ئاکاری بەرچاو..

بەم جۆرە بە ڕوونی دەبینین، ئەگەرچی ئاکار ناواخنێکی بگۆڕی هەیە، بەڵام شێوەکەی لە ڕوویەکی دیاریکراوەوە، شێوەیەکی گەردوونییە. (کانت) دەڵێت: ئازادی لە ویستیدا بۆ ئازادی کەسانی دیکە، بڕیار لەسەر خۆی دەدات، لە کاتێکدا ئەو لەو بڕوایەدایە کە ڕووکاری وێنەیی و ڕووکاری گەردوونیی پێکەوە دەتوانن زانستێک بۆ ئاکار پێکبهێنن. بەڵام ئێمە بە پێچەوانەی (کانت)ەوە دەڵێین: پرەنسیبە زۆر داماڵراوەکان (ئەبستراکتەکان) لە دیاریکردنی کاردا نوشووستی دێنن. لێرەدا جارێکی دی دەگەڕێینەوە بۆ نموونەی ئەو لاوەی پێشتر باسمان کرد و دەڵێین: بە ناوی چ ڕێسایەکی ئاکارییەوە لەو بڕوایەدان ئەو لاوە دەیتوانی دایکی بەجێبهێڵێت، یاخود لەگەڵیدا بمێنێتەوە و دڵ و ویژدانی ئارام بێت؟ ناکرێت لێرەدا هیچ بڕیارێک دەربکرێت، لەبەرئەوەی ماوەی بڕیاردان بەرچاوییە، پاشان بابەتی پێشبینی کردن نییە، چونکە ئافەریدە و داهێنان هەردەم لە

برەودایە و ئەوەی گرنگە ئەوەیە بزانین کە ئەو داهێنانە بە ناوی ئازادییەوە بە ئەنجام دەگەیەنرێت یان نا؟

دوو نموونە لە ئەدەبەوە وەرگیراون:

چیرۆکی "ئاشی سەر ڕووباری فلوس"..

با نموونەیەک بۆ ئەم دوو حاڵەتەی خوارەوە بهێنمەوە و دەبینین کە چۆن هەردووکیان کۆکن و ناکۆکیشن لە هەمان کاتدا: با یەکەمجار لە چیرۆکی "ئاشی سەر ڕووباری فلوس- **le Moulin Surla Floss**" بکۆڵینەوە، چی دەبینین؟ (ماگی تۆلیڤەر- **Maggy Tulliver**) کچێکە و بەهای خۆشەویستی بە شێوەیەکی هوشیارانە بەرجەستە دەکات، کە چۆن کەوتۆتە داوی خۆشەویستی (ئێستیفان)ەوە، کە ئەمیان لاوێکە و دەزگیرانی کچێکی دیکەی گەمژەیە. لەبری ئەوەی ماگی –بەبێ هوشیاری- بەختەوەری خودی خۆی لەهەر شتێکی دیکە بە باشتر بزانێت، دەبینین بە ناوی هاوکاری مرۆییەوە، خۆبەختکردن هەڵدەبژێرێت و واز لەو پیاوە دەهێنێت کە خۆشی دەوێت.

چیرۆکی "کڵێسای پارم"..

ئەگەر بڕیاردان لەم مەسەلەیەدا بۆ (سانسفرینا) بێت، کە ژنە پاڵەوانێکی (ستاندال- **Stendhal**)ە، لە کتێبەکەیدا (کڵێسای پارم- **la chartreusede parme**) ئەوا بەمجۆرە



بیرم دەکردەوە: "گومانی تێدانییە کە خۆشەویستییەکی ئاوەها مەزن، پێویستی بە خۆبەختکردنە، چونکە خۆشەویستی بەهای ڕاستەقینەیی مرۆڤ دەبەخشێت. کەواتە وا پێویست دەکات ئەو خۆشەویستییە توندوتۆڵە بە باشتر بزانرێت، لە بێمانایی خۆشەویستی هاوسەریتی؛ کە ئێستیفان و ژنە گەمژەکەی پێکەو دەبەستێتەوە.

هەروەها پێویستە ماکی بەختەوەرییە تایبەتییەکەی خۆی هەڵبژێرێت و ئەو ژنە گەمژەیە بکاتە قوربانی. (ستاندال) لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا بۆمان دەردەخات کە (سانسفرنیا)ش ئامادەیە لە پێناوی خۆشەویستیدا خۆی بەخت بکات، ئەگەر ئەو ژیانە ئەوە دەخوازێت.

شیکردنەوەی هەردوو هەڵوێستە بەرامبەرەکە..

ئێمە لێرەدا، لەبەردەم دوو جۆر دڵسۆزی تەواو هاوتادابن، بەڵام پێمان وایە کە هەردووکیان یەکسانن، لەبەرئەوەی ئازادی لە هەردوو حاڵەتەکەدا بە ئامانجێک دەستەبەر کراوە. دەتوانین هەردوو هەڵوێستەکە لە ڕووی دەرەنجامەکانەوە بە دوو هەڵوێستی تەواو لێکچوو وێنا بکەین: هەڵوێستی کچێک کە بە باوەڕەوە ئەوینەکەی خۆی دەکاتە قوربانی و، دەستهەڵگرتن لە پیاوەکە بە باشتر دەزانێت و، هەڵوێستی کچێکی دیکەش کە پێی باشترە گوێنەداتە ئەو پەیوەندییانەی



بوونەتــە ڕابــردووی ئــەو پیــاوەی خۆشــیدەویت. ئــەم دوو هەڵویستە لە ڕووکەشدا هەر لەو دوو حاڵەتە دەچن کە پێشتر وەسپمان کردن، بەڵام تەواو لە هەردوو حاڵــەتەکە جیــاوازن. هەڵوێستی سانسفرینا و هەڵوێستی ماگی تۆلیڤەر، پێ بە پێــی مــــەودای نێــــوان ئــــارەزووی شــــەهوانی ئاژەڵـــییانە و ئارەزوویەکی خەمساردانە لێکتر دوورن. بەم جۆرە دەبیــنین کە شێوەی دووەمی نــاڕەزایی دەربڕینەکــە لــە هــەمان کاتــدا ڕاستە و هەڵەشە، وە دەتوانرێت هەموو شتێک هەڵبژێردرێت، ئەگەر ئەو هەڵبژاردنە لەســەر ئاســتی پابەنــدبوونێکی ئــازاد-دانەدا بە ئەنجام گەیەنرابێت.

نۆرم و دابونەریتەکانی (بەهاکانی) بوونگەرایی..

بــەڵام شــێوەی ســێیەمی ئــەو ناڕەزاییــەی کــە ئاراســتەی ڕەوتــە (ئــارەزووە) خودگەراییەکــەمان دەکەنــەوە، بــەم جۆرەیە: ئەوەی بــە دەســتێک دەیبەخــشین، بــە دەســتەکەی دیکــە وەریدەگرینــەوە، واتــە دابونەریتــەکان جیــدی نــین، لەبەرئــەوەی خۆتــان هەڵــیدەبژێرن، بــەڵام ئێمــە لــە وەڵامــدا دەڵێین: جێگەی داخە شتەکان بەو شێوەیە بــن، بــەڵام ئەگــەر ئێمە خودای بــاوک-مــان خــستە لاوە، ئــەوا پێویــستە یــەکێک بوونی هەبێت کە ئەو دابونەریتانە دابهێنێت. کەواتە پێویــستە شــتەکان وەک خۆیــان وەربگــرین، ئەگــەر باســی داهێنــانی



دابونەریتەکانیشمان کردبێت، ئەوا مانای ئەوە دەبەخشێت؛ کە هیچ مانایەک بۆ ژیانی پێش خۆم نییە. ژیان، بەرلەوەی مرۆڤ تیایدا بژی، شتێکی ئەوتۆ نییە، تەنها مرۆڤ خۆیەتی کە مانایەک بە ژیان دەبەخشێت، لەبەرئەوەی بەها و نۆرم لەو مانایە زیاتر کە خۆی هەڵیدەبژێرێت، چی دیکە نییە. بەم جۆرە دەبینین: دەکرێت یەکگرتوویی مرۆیی ڕاستەقینە- **Humaine Communot'e** یان **humanity truth** ئافەریدە بکرێت.

ڕەوتی (مەیلی) مرۆییگەری

– هیومانیزم- **Humanism**..

گلەیی ئەوەم لێدەکەن، چونکە پرسم لەوە کردووە کە بوونگەرایی مەیلێکی مرۆییە و، دەڵێن: ئایا لە چیرۆکی (هێلنج- **Lanausee**)دا خۆت نەتنووسیوە کە ئەوانەی ڕەوتێکی (مەیلێکی) مرۆییان هەیە هەڵەن، ئەی گاڵتەی بە تەرزێکی دیاریکراو لە مرۆڤایەتی نەکردووە؟! ئیدی بۆچی ئێستا دەگەڕێیتەوە سەری؟

لە ڕاستیدا ئەو مەیلە دوو مانای هەیە، مەبەست لە مانای یەکەم؛ تیۆرییەکە، بەو پێیەی ئامانج و بەهایەکی باڵا دەگەیەنێت. ئێمە بەم مانایە مەیلی مرۆیی –هیومانیزم لای (کۆکتۆ- **Cocteau**) دەبینین، بۆ نموونە کاتێک لە زمانی



یەکێک لە پاڵەوانەکانیەوە، کە لە سەرووی شاخەکانەوە و بە هەوادا دەفڕێت، دەڵێت: بە ڕاستی مرۆڤ سەرسوڕهێنەرە! ماناکەی ئەوەیە؛ ئەگەرچی من بۆ خۆم ئەو فڕۆکانەم بنیاد نەناوە، بەڵام دەتوانم سوود لە فڕۆکە داهێنراوە تایبەتییەکانی دیکەش وەربگرم، هەروەها دەتوانم بەرامبەر بەوەش خۆم بە لێپرسراو بزانم، بەوپێیەی من مرۆڤم، ئەوکاتە لەگەڵ هەستکردنمدا بە لێپرسراوێتی، هەست بەوەش دەکەم من سەرپەرشتیارێکی ئەو کارە تایبەتییانەم، کە هەندێک کەس بە ئەنجامیان گەیاندووە. ئەوەی ئێستا وتمان، ئەوە دەسەپێنێت کە دەتوانین بەها بە مرۆڤێکی دیاریکراو ببەخشین، بە پشت بەستن بەو چاکە خوازییەی کەسانی دیکە بە ئەنجامیان گەیاندووە.

هیومانیزمی کلاسیکی..

بەڵام ئەم جۆرە لە هیومانیزم ماقووڵ و شیاو نییە، لەبەرئەوەی تەنها ئاژەڵ دەتوانێت بڕیارێکی تێکڕایی دەربارەی مرۆڤ بدات و ڕایبگەیەنێت کە مرۆڤ نایابە، هەر ئەمەیە کە ئاژەڵیش، وەک ئێمە بیزانین، بێ سێ و دوو لێکردن، دەیکات، بەڵام ئەو شتەی کە ناتوانین بڕوای پێبکەین، ئەوەیە: کە مرۆڤ بڕیار بەسەر مرۆڤدا بدات، هەرچی بوونگەراییە مرۆڤ لەم بڕیاردانە دەبەخشێت، بیریاری



بوونگەرا هەرگیز مرۆڤ وەک ئامانج وەرناگرێت، چونکە مرۆڤ لە دیدی بوونگەرادا پرۆژەی بوونیادنان و پێکهاتنی بەردەوامە. پێویستە بڕوا بە بوونی ئەو تەرزە مرۆڤایەتییە نەکەین، کە دەتوانین لەسەر ڕێگەی ئۆگست کۆنت- **Auguste Comte** بیپەرستین، ئەم پەرستنەش خۆتەرخانکردنە بۆوەی مرۆڤایەتی بەسەر خودی خۆیدا داخراو بێت، واتە بەرەو فاشیزم بڕوات. لەبەرئەوە ئێمە هەرگیز بەم تەرزە هیومانیزمە ڕازی نابین.

هیومانیزمی بوونگەرایی..

ئەگەرچی تێگەیشتنێکی دیکە دەربارەی ئەو ڕەوتە/ خواستە هەیە، ئەویش لە بنەڕەتەکەیدا ئەو مانایە دەبەخشێت کە؛ مرۆڤ هەمیشە لە دەرەوەی خودی خۆیدایە و، هیچ مرۆڤێک لە خودی خۆیدا پەی پێنابات، تەنها ئەگەر خودی خۆی لە دەرەوەدا بزر کردبێت. مرۆڤ بە هەوڵدانی بۆ ئامانجە بالاکان[7]/ ترانسێندێنتاڵەکان دەتوانێت بوونی خۆی بهێنێتە دی، چونکە مرۆڤ بە سروشتی خۆی بوونەوەرێکی بالایە (خۆبەزل گرە- متعال) و خۆی تێدەپەڕێنێت، تەنیا و بەدەر لەو تێپەڕاندنە، چ شتێکی دیکە ناخاتە ژێر باس و خواسەوە، کەواتە مرۆڤ لە ناخی تێپەڕاندندایە یان خۆی نێوجەرگەی تێپەڕاندنە.



بڵندگەرایی- ترانسیێندیێنتاڵ..

ئەو تاکە جیهانەی بوونی هەیە (لە بووندایە)، بریتییە لە جیهانی مرۆڤ، جیهانی خودگەرایی مرۆیی و ئەوەی پێی دەڵێین هیومانیزم؛ بریتییە لەو پەیوەندییەی بۆ مرۆڤ ڕەخساوە و کەوتۆتە نێو بالابوون- ترانسیێندیێنتاڵ و (نەک بەوپێیەی بڵندگەرایی خوداییە، بەڵکو بەوپێیەی کە تەنها تێپەڕاندنە) لە نێوان خودگەراییدا دامەزراوە، بەوپێیەی مرۆڤ بەسەر خۆیدا دانەخراوە، بەڵکو ئەو بەردەوام لە جیهانێکی مرۆیی دیاریکراودا ئامادەگی خۆی هەیە.

ئێمە پێی دەڵێین؛ خواستی مرۆیی/ هیومانیزم، لەبەرئەوەی ئێمە بە مرۆڤ دەڵێین هیچ دانەرێک نییە لە خۆی زیاتر و، لە ڕەوگە و ئاوارەییدا تەنیا ئەو بڕیار لەسەر چارەنووسی خۆی دەدات و، هەرواش بانگهێشتی بۆ دەکەین، چونکە هەروەها بۆی ڕوون دەکەینەوە؛ ئەو بوونە مرۆییەکەی خۆی ناهێنێتەدی، ئەگەر بەرەو ئاراستەکەی خۆی بڕواتەوە، بەڵکو بە هەوڵدانی بۆ ئامانجێکی دەرەکی، کە خۆی لە خۆیدا ڕزگاربوونێکە بۆ خۆی و هێنانەدی بوونی خۆیەتی.

بوونگەرایی و بێباوەڕی..



ئەوەی تا ئێستا وتمان، ئەوە ڕوون دەكاتەوە؛ هەر ڕەخنەیەكی/ نارەزاییەكی ئاڕاستەمان دەكرێت، لە ڕاستیدا ڕەخنەنین/ نارەزایی هەق نین، چونكە بوونگەرایی تەنها لە هەوڵدانێک زیاتر بۆ وەبەرهێنانی هەموو دەرەنجامە شیاوەكان، لە هەڵوێستێكی بێباوەڕی یەكگرتوودا، چی دیكە نییە. بوونگەرایی نایەوێت مرۆڤ لە لێشاوی بێهیواییەكی تاریكدا نقوم بكات، لەبەرئەوەی هەموو هەڵوێستێكی بێباوەڕی، نابێتە هۆی بێهیوایی، هەروەكو مەسیحییەكان لەو باوەڕەدان، بەڵكو خودی بێهیواییەكەیان شتێک نییە لەوە زیاتر كە لە (بنەڕەتەوە/ پێشینەوە- **Originellment**) دەیسەپێنێت. لە لایەكی دیكەوە بوونگەرایی بێباوەڕییەک نییە كە هەموو كۆششی خۆی لە سەلماندنی نەبوونی خودا-دا بخاتە كار، بەڵكو ڕایدەگەیەنێت؛ هیچ شتێک ناگۆڕێت، تەنانەت لەژێر سایەی بڕواپێكردنی ئاییینیشدا. ئا ئەمەیە بۆچوونی ئێمە، كێشەكەش، بوون یان نەبوونی خودا نییە، بەڵكو پێش هەموو شتێک؛ كێشەی مرۆڤە، كە پێویستە خۆی بدۆزێتەوە و، بڕوا بەوە بكات كە شتێک نییە لە خودی خۆی ڕزگاری بكات، تەنانەت ئەگەر ئەم شتەش سەلماندنێک بێت كە بە بوونی خودا-وە پابەندبێت، یان لەسەر بوونی خودا دامەزرابێت. بەم مانایە بوونگەرایی دەبێتە فەلسەفەی ڕوونبینی و كاركردن، لە نیازێكی خراپیشەوە نەبێت، هەرگیز



ناکرێت بوونگەرایی بە بێهیوایی تۆمەتبار بکرێت، هەروەکو چۆن مەسیحییەکان تۆمەتبارمان دەکەن، کاتێک بێهیوایی خۆیان و بێهیوایی ئێمە تێکەڵ بە یەکدی دەکەن.

وتووێژێک لە نێوان سارتەر و یەکێک لە مارکسییەکان:

*ناڤیل: - **Naville** کێشەی سادەکردنەوەی بوونگەرایی..
نازانم ویستی ئێوە لە خستنەڕووی ڕێبازەکەتانداو تێگەیشتنی خەڵکی بۆی، شتێکە یاریدەی خەڵکی دەدات باش لە بوونگەرایی تێبگەن، یاخود بە پێچەوانەوە. بەڵام لەوە دڵنیام؛ ئەو ڕوونکردنەوەیەی لە گۆڤاری (کار-**Action**)دا بڵاوتان کردۆتەوە، خراپ تێگەیشتنی خەڵکی لە ئێوە زیاتر دەکات، چونکە ئەو دەستەواژانەی بە کارتان هێناوە، بۆ نموونە وەکو: بێهیوایی و ڕەوگە و ئاوارەیی، کاریگەرییەکی زۆر بەهێزیان لە نووسینە بوونگەراییەکەتاندا هەیە. پێم وایە؛ بێهیوایی یان نیگەرانی شتێکی بنەچەیی و بنەڕەتییە لای ئێوە و تەنها بڕیاردانی مرۆڤ نییە لەوەدا کە هەست بە تەنیایی خۆی دەکات و پێویستە بڕیار لەسەر شتێک بدات، بەڵکو ئەوە هوشیارییە بەرامبەر چارەنووسی مرۆڤ، وەلی هوشیارییەکە لە هەموو دەمێکدا فەراهەم نابێت. یاخود ئەوەی؛ مرۆڤ بە بەردەوامی هەڵبژێرەری خۆی بێت، ئەمەیە

که ئێمه لەسەری تەباین، بەڵام ئەمەش ئەو مانایە نابەخشێت که نیگەرانی و بێهیوایی به شێوەیەکی بەردەوام لای مرۆڤ ڕوودەدات.

سارتەر.. بێگومان مەبەستم لەوە نییە، بۆ نموونە: کاتێک من یەکێک له دوو جۆر شیرینی هەڵدەبژێرم، ئەوا ئەو کردەیه له حاڵەتێکی نیگەرانیدا دەکەم، بەڵام نیگەرانی جێگیر و بە سەرەوتە، بەوپێیەی هەڵبژاردنە سەرەتاییەکەم، بریتییە لە شتێکی سەرەوت و جێگیر و نیگەرانی لە واقیعدا لە لەکیسچوونی گشتی/ هەمەکی بۆ پاساوهێنانەوە زیاتر، چی دیکە نییە و، لە هەمان کاتدا بەرپرسیارێتییە بەرامبەر هەمووان.

ناڤیل: من باسم لەو ڕوونکردنەوەیە کرد، کە لە گۆڤاری (کار)دا بلاوتان کردۆتەوە، وا دەبینم (بیانوو/ بەڵگە)ی ڕاوبۆچوونەکەتان تا ڕادەیەک لاوازە.

سارتەر: دەکرێت بابەتەکانم لە گۆڤاری (کار)دا بە شیکردنەوەیەکی لاواز شرۆڤە کرابنەوە، هۆکارەکەشی ئەوەیە؛ زۆربەی ئەو کەسانەی ئاستێکی باشی ڕۆشنبیرییان نییە، چەندین پرسیارم لێدەکەن، ئەوکاتەش خۆم لە بەردەم دوو هەڵوێستدا دەبینمەوە؛ یان دەبێت وەڵام نەدەمەوە، یان دەبێت بەو وتووێژە ڕازی بم کە ئاستێکی ساکاری هەیە.



منیش چارەسەری دووەمیانم هەڵبژارد، چونکە ڕێگرێکی ئەوتۆ لە سادەکاریدا نابینمەوە.

سادەکاری و پابەندبوون

ئێمە لە لایەکی دیکەوە، مژدەی فەلسەفەیەک دەبەخشین، کە بنەماکانی پابەندبوونە (یان لەسەر پابەندبوون دامەزراوە)، لەبەرئەوە پێویستە لەسەرمان تاوەکو کۆتایی بە خۆمانەوە پابەندبین. ئەگەر بڵێین بوون پێش بنەڕەت/ چییەتی کەوتووە، ئەوا دەبێت بۆوەی دڵسۆز بین، لەودا بژین، چونکە فەلسەفەی بوونگەرایی شتێک نییە بە نووسین بسەپێنرێت، بەڵکو باوەڕێکە و پێویستە لە پێناویدا خۆبەخت بکەین، لەبەرئەوەش کە بوونگەرایی فەلسەفەی پابەندبوونە؛ ئەرکێکی سەرشانمانە کە بە وردی بیخەینە ڕووی ئەو کەسانەی لە بارەی سیاسەتەوە، یان لە بارەی (ئاکار/ مۆڕاڵ)ەوە وتووێژمان لەگەڵدا دەکەن.

فەلسەفە و سیاسەت

ئەگەر ئێوە بە هۆی قسەکانم لە باری هیومانیزمەوە گلەییم لێدەکەن، ئەوا دۆزەکە/ مەسەلەکە بەم جۆرە دەخرێتەڕوو: یان دەبێت باوەڕەکەمان تەنها لە ئاستێکی فەلسەفی پوختدا دابنێین، ئەوکاتەشی کاریگەرییەکەی دەکەوێتە ژێر بار و چۆنیەتی ڕێکەوتەوە، یان دەبێت بە



سـادەکردنەوەی ڕازی بـین، بـێ ئـەوەی ئـەو سـادەکارییە فەلسەفەکە بـشێوێنێت، چونکـە بوونگـەرایی دەیـەوێت ببێتـە فەلسەفەی پابەندبوون، لـە لایـەکی دیکەشـەوە، لەبەرئـەوەی خەڵکی لە ئاستی فەلسەفەی پوختەوە تەماشـای بوونگـەرایی ناکەن.

ناڤـیل: ئەوانـەی دەیانـەوێت لێتـان تێبگـەن، تێدەگـەن، ئەوانەش کە نایانەوێت، لێتان تێبگەن، ئەوا لێتان تێناگەن.

سارتەر.. هەڵوێستی مارکس..

پێم وایە تۆ، ڕۆڵی فەلـسەفە لـە کۆمەڵـگەدا بـە شـێوەیەک وێنادەکەیت کە ڕووداوەکان تێپەڕاندوون، لە کۆنـدا بیریـاران تەنها لە لایەن بیریارانـەوە هێرشـیان دەکرایـە سـەر و، ئـەو دەمەش مرۆڤی ئاسایی لە هـیچ تێنەدەگەیـشت و بایـەخی بـە هیچیش نەدەدا، بەڵام ئەمڕۆ ئەوان فەلسەفە بەرەو گۆڕەپانی گشتی ڕاپێچ دەکەن. بۆ وێنـە: ئایـا کـارل مـارکس هـەردەم بیرۆکە فەلسەفییەکەی خۆی سادە نەدەکردەوە، هەروەک لـە کتێبەکەیـدا "بـەیانی/ مانیفێـستی کۆمۆنیـست- **Manifeste Communiste** یـان **Manifesto of the communist**" کردی؟

ناڤـیل: بـەڵام هەڵـبژاردنەکەی مـارکس، هەڵـبژاردنێکی شۆڕشگێڕییە.



سارتەر: ئەی کێ دەتوانێت بڵێت: مارکس لە سەرەتادا خۆی وەک ڕۆڵەی شۆڕش هەڵنەبژاردووە و ئەوجا دوایی وەکو فەیلەسووفێک؟ یان ئەو بە پێچەوانەوە ڕەفتاری نواند؟ من لەو بڕوایەدام؛ مارکس لە یەک کاتدا فەیلەسوف و ڕۆڵەی شۆڕشە. لە لایەکی دیکەوە، مەبەستت چییە لەوەی کە مارکس خۆی وەک ڕۆڵەیەکی شۆڕش هەڵبژاردووە؟

ناڤیل: فەلسەفەی مارکسیزم و سیاسەتی مارکسیزم..

بە بڕوای من (مانیفێستی کۆمۆنیست) سادەکردنەوەی فەلسەفەی مارکس نییە، ئەوەندەی کە چەکێکە بۆ تێکۆشان، لەبەرئەوە هەرگیز گومانم نییە، کە ئەوە کردەیەکی پابەندبوونە، کاتێک مارکس گەیشتە ئەو دەرەنجامەی کە شۆڕش ناچارییەکی پێویستە، (مانیفێستی کۆمۆنیست) بووە نۆبەرەی کارەکانی، کە ئەوەش کارێکی سیاسییە. (بەیان/ مانیفێست) ئەو پەیوەستییەیە کە فەلسەفەکەی بە کۆمۆنیزمەوە دەگەیەنێت. بەڵام ئێوە ئەو ئاکارەی باسی لێوەدەکەن، هەرچۆنێک بێت، ئێمە هەست بەوە ناکەین کە لە نێوان ئەو ئاکارە و فەلسەفەکەتاندا پەیوەستییەک هەیە، کە توندوتۆڵتر بێت لەوەی کە هەیە، لە نێوان (مانیفێستی کۆمۆنیستی) و لە نێوان فەلسەفەی مارکسدا بەدی دەکەین.

سارتەر.. مانای پابەندبوونی بوونگەرایی..

ئێمە بانگهێشتی ئاکاری ئازادی دەکەین، ئەگەر هیچ ناکۆکییەکیش لە نێوان ئەو ئاکارە و فەلسەفەکەماندا نەبێت، ئیدی چ شتێکی دیکەمان لێ داواناکرێت! جۆرەکانی پابەندبوون جیاوازن، بێگومان بە گوێرەی سەردەمەکان. نووسینی (مانیفێستی کۆمۆنیست) لە سەردەمێکدا پێویست بوو، کە تیایدا پابەندبوون بریتی بوو لە کارکردن لە پێناوی شۆڕشدا، بەڵام لە سەردەمێکدا، کە تیایدا حزبە جیاجیاکان ڕایدەگەیەنن: ئەوە سەردەمی شۆڕشە، پابەندبوونیش نابێتە هەڵبژاردنێک بۆ هیچ کام لەم حزبانە، بەڵکو هەوڵێکە بۆ ڕوونکردنەوەی بیروبۆچوونەکان، لە پێناو دیاریکردنی هەڵوێستدا و لە پێناو هەوڵی کارتێکردنە سەر حزبە شۆڕشگێڕە جیاجیاکان.

ناڤیل..

ئەو پرسیارەی دەکرێت ئێستا بیخەینەڕوو، بە پشتبەستن بەو خاڵانەی ڕوونتان کردەوە، ئەوەیە: پێتان وا نییە باوەڕی ئێوە لە قۆناغی داهاتوودا، بۆ ژیاندنەوەی سۆشیالیستی ڕادیکاڵی خۆی دەخاتەڕوو؟ پێدەچێت ئەم پرسیارە سەیربێت، بەڵام پێویستە بەم شێوەیە ئاڕاستە بکرێت.

بوونگەرایی و سۆشیالیزمی ڕادیکاڵی..

ئەگـەر لـە چـەقی بەیەککگەیـشتنی ئـەو خاڵـە جیاوازانـە بتۆژینــەوە، کــە خۆتــان خــستۆتە نــاوی، واتــە بــۆ ڕووە جیاوازەکـانی بوونگـەرایی، پـێم وایـە؛ ئێمـە لـە ژیاندنـەوەی ڕەوتی ئازادیخوازیـــدا (لیبرالیـــزم- **libe'ralisme** یـــان **Leberalism**) بەدی دەکەین، چونکە فەلسەفەی ئێوە هەوڵی ژیاندنـەوەی ئـەو دۆخـە دەدات، کـە کرۆکـی سۆشـیالیزمی ڕادیکاڵـی لەسـەرچێبوو، ئـەویش لـە چەنـد مـەرجێکی زۆر تایبەتدا، کە مەرجـە مێژوویـیـەکانی هەنووکەیـە و، مـۆرکێکی تایبەتی بە فەلسەفەکەتان دەبەخشێت. تەنگژەی کۆمەڵایـەتی جیهانی ڕێگە بە دووبارەبوونەوەی لیبرالیزمـی کـۆن نـادات، بەڵکو پێویستی بە لیبرالیزمێکی دیکەیە، کـە بـە ئەشـکەنجە و نیگەرانی ئارایشت کراوە.

بوونگەرایی و لیبرالیزمی نوێ-
**Neo- libe'ralisme** یان **New- Leberalism**..

پێم وایە هۆکاری قووڵ و فرەلایەن هەن، کە پاساو بۆ ئـەو بــڕیارە دەهێننــەوە، تەنانــەت ئەگــەر لەســەر دەربڕینــە تایبەتەکانیـشتان پوختـەی بکەینـەوە. لـەم شـیکردنەوەیەی ئێـستاشدا کـە خـستانەڕوو، ئـەوە ڕوون دەبێتـەوە کـە؛ فەلـسەفەی بوونگـەرایی، بەوپێیـەی فەلـسەفەیەکی مرۆییـە/ هیومانییە، خۆی دەخاتەڕوو، فەلسەفەی ئازادیشە، لەوە زیاتر



کــــه لـــــه بنەڕەتـــــدا تـــــەنها پـــــرۆژەی پابەندبوونـــــه- **Pre’engagement** و پرۆژەیەکه دیاری ناکرێت، ئیدی چـی دیکه نییه. ئێوه لەگەڵ زۆر کەسدا، ئابڕووی گشتی مرۆیـی و ئابڕووی باڵای تایبەتی مرۆیی له پێشـەکیدا دادەنێن، ئەوانیش دوو بابـەتن (**deux the’mes** یـان **Two themes**) کـه لـه بابەتـــەکانی لیبرالیزمـــەوه نـــزیکن، پاشـــان ئێـــوه لـــه پێنـــاو پاساوهێنانەوه بۆ ئـەم دوو بابەتـه، جیـاوازی لـه نێـوان دوو تـــەرزه تێگەیـــشتن لـــه هیومـــانیزم و لـــه نێـــوان دوو جـــۆره تێگەیـــشتن لـــه بـــارودۆخی مـــرۆڤ و لـــه نێـــوان دوو مانـــای زۆربـــەی دەســـتەواژەکان دەکـــەن، کـــه تۆژراونەتـــەوه و مێژوویـــەکی ئامـــاژەپێکراوه و دەلالـــەت لـــەوه دەکـــەن کـــه دووفاقی/ دوالیزمی ماناکەی، به هۆی ڕێکەوتەوه نییه.

ئێستا واز له هەموو ئەو کێشه تایبەتییانـه دەهێـنم، کـه بـه هونـــەری فەلـــسەفییەوه بەســـتراونەتەوه، ئەگـــەرچی چێـــژ و گرنگی خۆی هەیه و، بایەخ بەو وتانه دەدەم کـه گـوێم لێیـان بوو، لەسـەر خاڵێکی بنـەڕەتی دەوەسـتمەوه، کـه بـه ڕوونی دەریـدەخات؛ ئێـوه هێـشتا لـه مانـای کـۆنی هیومانیزمـدان، سەرەڕای جیاکارییەکەی پێشووتان.

سروشتی مرۆیی..



مرۆڤ بە لای ئێوەوە، هەڵبژاردنێکە پێویستە هەمیشە ئافەریدە بکرێت، ئەو، بەر لە هەموو شتێک بوونێکە لە ئێستادا لە دەرەوەی هەربوونایەتی/ ناچاریی سروشتیدا، پێناسە ناکرێت بە شێوەیەک بەر لە بوونی، بەڵکو بە گوێرەی بوونی هەنووکەییەوە پێناسە دەکرێت. لە بۆچوونی ئێوەدا سروشتێکی مرۆیی بالاتر لە مرۆڤ، بوونی نییە، بەڵکو بوونێکی چۆنیەتی -نوعی- هەیە، کە لە کاتێکی دیاریکراودا پێی دەبەخشرێت.

بەڵام وا دەپرسم: ئایا بوون بەم مانایە شێوەیەکی نوێ نییە بۆ چەمکی سروشتی مرۆیی، کە بە ڕێگەیەکی نوێ و تەنها لەبەر هۆکاری مێژوویی گوزارشتی لێدەکرێت؟ چەمکی بوون لای ئێوە، هەروەک لە یەکەم ساتەوە بەدەردەکەوێت، لە چەمکی سروشتی مرۆیی دەچێت، هەروەک فەیلەسوفەکانی سەدەی هەژدە دیارییان کردبوو و، ئێوە دەتانەوێت ئێستا چەمکەکەی ڕەت بکەنەوە. ئێمە ئەو سروشتی مرۆییە لە دەربڕینی دۆخی مرۆڤ ( **Situation de I'homme** یان **Situation of human**) دا دەبینین، کە فەلسەفە بوونگەراییەکەی ئێوە بەکاری دەهێنێت. تێگەیشتنی ئێوە سەبارەت بە بارودۆخی مرۆڤ، تەواو لە گۆڕینی ئەو سروشتەی هەیەتی (کە ئێوە ڕەتی دەکەنەوە) زیاتر چی



دیکە نییە، هەروەها ئەو ئەزموونەی مرۆڤ تیایدا دەژی، ئێوە
بە ئەزموونێکی هەرەمەکی یان زانستی دەیگۆڕنەوە.



چەمکی دۆخی مرۆڤ جێگەی چەمکی سروشتی مرۆیی دەگرێتەوە..

ئەگەر بەوپێیە بڕوانینە بارودۆخی مرۆڤ کە بارودۆخێکە، نەک بە چوارچێوە سروشتی و دیاریکردنە پۆزەتیڤەکەی دەناسرێتەوە، بەڵکو بە نەزانراوی/ نەناسراوییەکەی (مجهول- **unx**)، کە ئەویش نەزانراوی/ نەناسراوی کەسی مرۆییە، ئەوا ئێمە لە بەردەم شێوەیەکی نوێی سروشتی مرۆییدایین کە بەوە دەناسرێت؛ پوختەی نموونەیەکی ڕووتە (ئەبستراکتە) لە مرۆڤ، هەروەها وەک شتێک دەردەکەوێت کە بە ئاسانی شرۆڤە ناکرێتەوە، بە هۆی بارودۆخی مێژوویی دیاریکراوەوە.

تەنگژەی بیرۆکەی گشتیر گەردوونیی..

سروشتی مرۆیی لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا، لەنێو چوارچێوە کۆمەڵایەتییەکاندا دەناسرێتەوە، وەکو؛ شێوونەوەی سستمە کۆمەڵایەتییەکان بە شێوەیەکی گشتی و چینە کۆمەڵایەتییەکان و بە ناکۆکییانەوە و ئەو تێکەڵبوونە زۆرەی لە نێوان میللەتاندا ڕوودەدات. لەبەرئەوە، بیرۆکەی سروشتی مرۆیی تاک شێوە و کورتکراوە، شایانی وێناکردن نییە، بە سیفەتە گشتی و شێوە گەردوونییەکەی، هەروەکو لە سەدەی

هەژدەدا وێنا دەکرا، کاتێک فەیلەسوفەکان بە پشتبەستن بە بیرۆکەی پێشکەوتنی بەردەوام-**Progre’s continu** دەریاندەبڕی.

بەڵام ئەمرۆ خەڵکانێک دەبینین بیردەکەنەوە یان بە ساویلکەیی باس لەم کێشەیە دەکەن و، سروشتی مرۆیی بە وشەیەکی دیکە دەردەبڕن، ئەویش (دۆخی مرۆڤە)، بە شێوەیەکی نادیار و ئاڵۆز و بە ڕەنگێکی دراماتیکی دەریدەبڕن، کە بارودۆخ بەسەریاندا دەیسەپێنێت. ئەو کەسانە، ئەگەر لە دەربڕینێکی گشتی دۆخی مرۆڤەوە نەگوازنەوە بۆ پشکنین و دیاریکردنی مەرجە کردەییەکانی ئەو بارودۆخە، ئەوا پارێزگاری لە نموونەیەک، لە پەیکەرێک/ سکێچێک دەکەن بۆ دەستەواژەیەکی ڕووت، ئەویش تەواو لە سروشتی مرۆیی دەچێت.

سروشتێکی بێهیوا..

بەمجۆرە دەبینین بوونگەرایی بەستراوەتەوە بە بیرۆکەیەکەوە سەبارەت بە سروشتی مرۆیی، نەک بەو خەسڵەتەی سروشتێکە شانازی بە خۆیەوە دەکات، بەڵکو وەک بارودۆخی مرۆڤێکی ترساو، دوودڵ، نیگەران، ئاوارە. کاتێکیش بوونگەرایی باس لە بارودۆخی مرۆڤ دەکات، ئەوا مەبەستی لە بارودۆخێکە، کە بە تەواوی و بە ڕاستی پابەند

نییــە بــەوەی پێــی دەڵــێن پــڕۆژەکان. ئــەویش لــە پــڕۆژەی بـــــارودۆخ- **Pre-conditio** زیـــــاتر نییـــــە، هـــــەروەها پابەنــدبوونیش بریتییـــە لـــە پـــڕۆژەی پابەنـــدبوون- **Pre-engagement**.

پێش چوونەپاڵ..

کەواتە شتێکی ڕێکەوت نییە، ئەو بارودۆخـە بـە خەسـڵەتە مرۆییـە گـشتییەکەی بناسـرێتەوە، لەگـەڵ ئەوەشـدا؛ کاتێـک ئەوان پێشتر باسیان لە سروشتی مرۆیی دەکرد، مەبەسـتیان لە شتێکی زیاتر دیـاریکراوو لـە چـەمکی بـارودۆخی مرۆیـی بوو، ئەوەش لەبەرئەوەی سروشتی مرۆیی شتێکی جیـاوازە لــە بارودۆخەکـەی؛ مۆدیلێـک نییــە لــە مۆدێلــەکانی بــوونی مــرۆڤ، لەبەرئــەوە باشــتر وایــە بــاس لــە ڕەوتی/ مــەیلی سروشـــــــتگەری (نـــــاتورالیزم- **Naturalisme** یــــــان **Naturalism**) بکەین لەبری ئەوەی باس لە ڕەوتی/ مـەیلی هیومانیزم بکەین. چونکە ناتورالیزم ڕاستییەکانی زیاتر لەخۆ گرتووە، وەک هیومانیزم، هەروەکو ئێوە لێی تێدەگەن.

سروشتی مرۆیی و مێژوو..

ئێمــە لێــرەدا لەبــەردەم واقیعێکــی دیــاریکراوداین و، هــەر بەوەندەشــەوە ناوەســتین، بەڵــکو پێویــستە وتووێژەکــەمان دەربارەی سروشــتی مرۆیــی فراوانتــر بکــەین، لەبەرئــەوەی ئەرکی سەرشانمانە، ڕاوبۆچـوونی مێژوویـی بخەینـە سـەر.



لەبەرئـەوەی واقیعـی یەکـەم بریتییـە لـە واقیعـی سروشـتی، واقیعی مرۆییش ئەرکێکە لـە ئەرکـەکانی و چـی دیکـە زیـاتر نییە.

بوونگەرایی نکوڵی لە مێژوو دەکات..

پێویستە لە پێناو ئەوەدا، بڕوا بـە ڕاسـتیی مێـژوو بکـەین، بەڵام هزرمەندی بوونگەرا، بە شێوەیەکی گشتی، نە لە ڕووی مرۆییەوە بۆ مێژوو، نە لە ڕووە سروشتییەکەیەوە بڕوا بـەم ڕاسـتییە ناکـات. لەگـەڵ ئـەوەی بـە بـڕوای ئێمـە؛ مێـژوو تاکەکەسان دروستدەکات. ئەوان لە جیهانێکدا لەدایک نـابن و دەرناکەون، تەنها بە مەرجێکی بنەبڕی (بـوون)یـان دابنرێـت، بەڵکو مێژووە تایبەتەکەیان وادەکات لەو جیهانەدا دەربکەون، کە بە لای ئەوانـەوە وەک (گـشت/ هەمـەک) وایـە لـە (بـەش/ ئەندەک)دا. ئەوە جیهانێکە، مەرجەکانی بوونی خۆیان دیاری دەکات، لەگەڵ ئەوەی خۆشیان لـە دیـاریکردنی مەرجـەکانی بوونی خۆیاندا تەواو بەشدارییان هەیە، هەروەک چۆن دایـک مەرجەکانی بوونی کۆرپەلەکەی دیـاری دەکـات و هـەروەها وەک چـۆن کۆرپەلـەش هـەر لەوکاتـەی کەوتۆتـە منداڵـدانی دایکییەوە، مەرجـەکانی بـوونی دایکـی دیـاری دەکـات. لـەم ڕووەوە مـافی ئـەوەمان هەیـە بـاس لـە بـارودۆخی مرۆیـی بکەین، بەوپێیەی ئەو بارودۆخە یەکەمین واقیعە، لەبـەر ئـەوە



پێویسته بڵێین؛ یەکەمین واقیع بارودۆخی مرۆیی نییـه، بەڵـکو بارودۆخی سروشتییە.

بارودۆخی مرۆیی بە شێوەیەکی گشتی، بوونی نییە..

من لێرەدا ئەو بۆچوونانە دەڵێمەوە کە لە گۆرێدان و باو و ناسراون، بـەڵام هـیچ شـتێک لەوانـە پووچـەڵ ناکاتـەوە، کـە پێـشتر دەربـارەی فەلـسەفەی بوونگـەرایی خراوەتـە ڕوو. ئەگەر نەبوونی سروشتی مرۆیی پوخت و نەبوونی چییـەتی سەربەخۆ لە بوونی مرۆڤ، یان، پێش بوونەکـەی کـەوتووە، شتێکی ڕوون و ئاشکرابوو، ئـەوا؛ بـە دڵـنیاییەوە بـارودۆخی مرۆیی گشتیش بوونی نییە، تەنانەت ئەگـەر بـە جۆرێـک لـەو بارودۆخە تێگەیشتبین، کە ئـەوە کۆمەڵـێک بارودۆخـە، واتـە سەرجەمی بارودۆخێکی بەرچاو و دیارە، هۆکـاری ئـەوەش؛ لــه بۆچــوونی ئێــوەدا ئــەو بارودۆخانــه پێکــەوە نەبەستراونەتەوە.

بەهەرحاڵ، مارکسیزم لـەم بابەتـەدا بیرۆکەیـەکی جـودای هەیە، ئـەویش بیرۆکـەی (سروشـت لـە مرۆڤـدا)و بیرۆکـەی (مـرۆڤ لـە سروشـتدا)یـە، هۆکارەکەشـی ئەوەیـە؛ مـرۆڤ هەمیشە لە ڕووی تاکگەراییەوە، پێناس ناکرێت.

مرۆڤی بابەتی..



ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت؛ مرۆڤ یاسای کارکردنی هەیە، هەروەکو هەموو بابەتێکی زانستی دیکە، ئەم یاسایانەش، بە هەموو هێزێکی ئەم وشەیەوە، سروشتی مرۆڤ پێکدەهێنن، ڕاستە ئەم سروشتە دەگۆڕێت، بەڵام لە دیدی "دیاردە ناسییەوە- **Phe'nome'nologie** یان **Phenomenology**" تەواو دوورە، واتە دوورە لەو دەرککردنە ئەزموونییەی مرۆڤ هەستی پێدەکات و تیایدا دەژیو ئەوەی هەستی هاوبەش پێمان دەبەخشێت، یان بە مانایەکی دیکە؛ ئەوەی فەیلەسوفەکان پێی دەڵێن: (هەستی هاوبەش- **Sens Commun** یان **Common Sense**)، بەم مانایە دەبینین؛ چەمکی سروشتی مرۆیی، هەروەک لای بیریارانی سەدەی هەژدەدا بینراوە، کە بێگومان زیاتر لە چەمکی مارکسەوە نزیکترە وەک لە ئەڵتەرناتیڤە بوونگەراییەکەی، واتە لەو بارودۆخە مرۆییەی کە گوزارشت لە دیدی دیاردەیی پوخت دەکات.

مرۆییخوازی و ئازادیخوازی

(هیومانیزم و لیبرالیزم)

لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا، هەموو تەوژمە فەلسەفییەکان بە مرۆییخوازی ناوزەد دەکرێن، نەک تەنها بە دوو مانای لێکترجیا، بەڵکو گەلێک لەوە زیاتر. هەموو ئەو کەسانەی



مـــەیلی مرۆییخوازیـــان هەیـــە، تەنانـــەت هەنـــدێک لـــەو مارکسییانەش کـە لـە خۆیانـدا مـەیلی ئەقڵانیـەتی کلاسـیکی دەدۆزنـەوە، بـەڵام مرۆییخـوازی ئـەو کەسـانە لـەچاو ئـەو بیرۆکە ئازادانەی لە سەدەی ڕابردوودا لە ئارادا بوون و، لـەم تەنگژەیەی ئێستاشدا هەر لە ئارادان، لقـی لێبۆتـەوە، ئـەویش مرۆییخوازییەکە، کە تاموبۆی تێدا نییە.

ئەگـەر مارکـسییەکان لــە توانایانـدا بێـت بانگهێـشتی هیومانیزم بکەن، ئەوا ئایینە جیاوازەکانیش، لە مەسیحییەت و هیندۆسی و چەندین ئـایینی دیکـەش، هـەر ڕایدەگەیـەنن کـە ئەوان بەر لە هـەموو شـتێک، مـەیلی مرۆڤـایەتییان لـە ئـامێز ناوە، هەروەها بوونگەرایی و فەلسەفەکانی دیکـە و زۆربـەی ئەو تەوژمە سیاسییانەی لە ئارادان، هەر ئەوە ڕادەگەیەنن کە مرۆییخـــوازن. هـــەموو ئەوانـــە تـــەرزە هەوڵـــدانێکن، کـــە ئامانجەکـەی گەڕانەوەیـە بـۆ ئـەو فەلـسەفەیەی پابەنـدبوون ڕەتدەکاتـــەوە، ســـەرەڕای بانگهێـــشت کردنیـــان بـــۆی، ڕەتکردنەوەکەش تەنها لە لایەنی سیاسـی و کۆمەڵایەتییـەوە نییە، بەڵکو لایەنی فەلسەفیی پوختیش دەگرێتەوە.

مەسیحییەت و بوونگەرایی..

بەڵام ئەگەر مەسـیحییەت ڕایگەیانـد؛ ئـەو بـەر لـە هـەموو شتێک هیومانیزمە، لەبەرئەوەی پابەنـدبوون ڕەتدەکاتـەوە و،

لەبەرئــەوەی ناتوانێــت پابەنــد بێــت و لــە جــەنگی هێــزە پێشکەوتووخوازەکاندا بەشداری بکات، ئەوا لە دیـدی ئێمـەدا؛ مەسـیحییەت هەڵوێـستێکی کۆنەخوازانـە بەرامبـەر شـۆڕش وەردەگرێت. بـەڵام ئەگـەر ئـازادیخوازان و بانگهێـشتکارانی مارکسیزم قسە لەسەر تایبەتێتی کەسی مرۆیـی بکـەن، ئـەوا لەبەرئەوەیە؛ ئـەوان لـە بـەردەم پێویـستییەکانی بـارودۆخی هەنووکــەیی جیهانــدا پاشەکــشێی بــۆ دەکــەن. هــەروەها بوونگەراییــەکانیش، بەوپێیــەی ئــەوان خــاوەن مــەیلێکی ئازادیخوازن- لیبراڵین، ئەگەر بە گشتی قسە لەسـەر مـرۆڤ بکــەن، ئــەوا لەبەرئــەوەی توانــای دەربــڕینیان نییــە لــە هەڵوێـستێک، کـە لـە ئاکـامی کارەسـات و بارودۆخەکانـدا دەســەپێنرێت. ئــەو تاکــە هەڵوێــستە پێــشکەوتووخوازەی چاوپۆشــی لێدەکــەین، هەڵوێــستی مارکــسیزمە، ئــەوە تاکــە دیدێکــە، کــە بــە شــێوەیەکی ڕاســت گرفتــەکانی ســەردەم دەخاتەڕوو.

مرۆڤ و ژینگە..

ئێمە لەو بڕوایەداین ئازادیی هەڵـبژاردنی نییـە، ئەگـەر بـە تەنگ ئەو هەڵبژاردنەوە هات، کە بە بێ ئـەو، کـردەو بایـەخی مرۆڤ، مانای خۆی لەدەست دەدات.



پاشان هەر ئەوەندە بەس نییە بووتریت؛ خەڵکی لە پێناو ئازادیدا تێدەکۆشن، بەبێ ئەوەی بە تەواوی ئازادی بناسن، ئەگەر ئێمەش مانای تەواوەتی بەو ناسینە ببەخشین، ئەوەی دەگەیاند کە؛ کەسانێک هەن پابەند دەبن و لە پێناو کێشەیەکدا تێدەکۆشن کە باڵی کێشاوە بە سەریاندا و، نەک تەنها لە خۆیانەوە تێدەکۆشن، بەڵکو هەروەها لەنێو چوارچێوەیەکدا کە ئەوان تێدەپەڕێنێت. ئەگەر مرۆڤیش لە پێناوی ئازادیدا تێبکۆشێت، بەبا ئەوەی ڕێگەی تێکۆشان و ئامانجەکەی بزانێت و بڕیاری بۆ بدات، مانای ئەوە دەبەخشێت؛ کردەوەکانی چەندین ئاکامی هەیە و لە تۆڕی ئەو هۆکارانەدا ڕیزبوون کە ئەو دەروازەکانیشی نازانێت، لەگەڵ ئەوەی دەورەی کارەکەیان داوە و، بەلای کەسانی دیکەوە ئەو ژینگە سروشتییەی کاری تێدا دەکەن، ماناکەی پێدەبەخشێت.

بەڵام هەڵبژاردن لە بۆچوونی ئێوەدا؛ لە پرۆژەی هەڵبژاردنی ئەو ئازادییە زیاتر نییە، کە لە ئازادی کەمتەرخەمی/ خەمساردی- **depr'e- indiffe'rece liberte** یان **Indiffrance liberty** دەچێت، وێناکردنیشتان بۆ بارودۆخی مرۆڤ و ئازادییەکەی بارمتەکراوە بە پێناسێکی دیاریکراوی شتەکان، کە هەموو ئەو شتانەی ماونەتەوە، لێی پەیدا دەبێت. ئێوە بە گەڕانەوەتان بۆ بوونی بوونەوەرە لێکدابراوەکان/ نابەردەوامەکان، تابلۆیەکی



جیهانی شتەکان بە جۆرێک دەکێشن، وەک ئەوەی ئەویش لێکدابڕاو/ نابەردەوام بێت. بەوەش هەموو مەیلێک/ ڕەوتێک بۆ هۆکارگەریی **tout causalisme** – یان **Causalism** پووچەڵ دەکرێتەوە و، لە پەیوەندییەکی سەیر و نامۆ زیاتر، چی دیکە نامێنێتەوە، ئەویش پەیوەندییەکی میکانیکی و لێکدابڕاوە و نائاشکرایە، کە شایانی گاڵتەجاڕییە و چی دیکە نییە.

لەبەرئەوە مرۆڤی بوونگەرا لەنێو جیهانێک لە ئامراز و بەربەستە بوودەڵەکاندا پێ هەڵدەنووتا، کە پێکەوە بەستراون و پشت بە یەکتر دەبەستن، ئەگەرچی لە دیدی بوونگەرادا؛ بە مۆرکێک دەستنیشان کراوە، کە دەیترسێنێت و هەموو فەیلەسوفە ئایدیالیزمییەکانیش- **ide'alistes** دەترسێنێت، کە ئەویش مۆرکێکی ڕووکەش و دەرەکییە، پوختە – **exte'riorite pure** یان **external pure**.

یەک جیهان/ جیهان (یەکە)..

گومانی تێدانییە کە هۆکارگەری لەو جۆرە میکانیکییەی کە هەر بوونایەتی/ ناچاری پووچەڵ دەکاتەوە، وێنای شتەکان بەوپێیە دەکات؛ کە تەنها ئامرازن. بەڵام ئەو جیهانە لە کوێوە دەستپێدەکات و لە کوێدا کۆتایی پێدێت؟ کە پێناسەکەشی لەگەڵ دەستەبەرەکانی/ پێدراوەکانی زانستی نوێدا گونجاوو



هاوئاهەنگ نییە! بە لایەن ئێمەوە جیهان نە سەرەتای هەیـە و نـە کۆتـایی هەیـە، لەبەرئـەوەی؛ ئـەو جیاکارییـەی بیریـاری بوونگەرا لە نێوان ئەو جیهانە و سروشتدا دەیـسەپێنێت، یـان بە مانایەکی دی، ئەو جیاکارییەی لـە نێـوان جیهـان و دۆخـی مرۆڤدا دەیسەپێنێت، جیاکارییەکی ڕاست نییە لە دیدی ئێمەدا، لە یەک جیهان زیاتر نییـە، ئـەو جیهانـەی خەڵـکی و شـتەکان دەگرێتەوە و، دەکرێت بەوە نیـشانە بکرێـت کـە لـە هەنـدێک مەرجی گۆڕڕاودا، بابەتییە.

هەرچی ئەستێرە و گوڵ و تووڕەبوونە، ئەوا باسیان لێـوە ناکەم، بەوپێیەی ئامرازن، بەڵام جەخت لـەوە دەکەمـەوە کـە؛ ئازادی و مەیلـە/ ڕەوتـە ئایدیالیزمەکـەی ئێـوە هـەردووکیان دەرەنجـامی گاڵـتەجاڕین بـە شـتەکان، شـتەکانیش تـەواو جیاوازن لەو وەسپەی ئێوە بۆی دەکەن. ڕاستە ئێـوە دان بـە بوونـە سـەربەخۆکەیدا (لـە خـودی خۆیـدا) دەهێـنن، بـەڵام بوونێکی نێگەتیڤ و ناکۆکییەکی هەمیـشەییە، چونکـە بـە ڕای ئێوە ناکرێت زانایەکی فیزیایی یان بایۆلۆژی ببێتە چاوگەیەک بـۆ مەرجـەکانی دیـاریکردنی دۆخـی مـرۆڤ. لەبەرئـەوە؛ جیهانی بابەتی بە لایەن ئێوەوە تەنها هەلێکە بۆ نوشوستی، ئـەوەش لـە بـاس و خواسـتانەوە دوورە، چونکـە ئێـوە لـە بنەڕەتەکەیدا وەک ئەگەرێکی/ شیاوێکی هەمیشەیی دەیبیـنن،



ماناکەشــی ئەوەیــە؛ بــە پێچەوانــەی ئــەو جیهانەوەیــە کــە ماتریالیزمی مارکسیزم وێنای دەکات.

پابەندبوونی بوونگەرایی، پابەندبوونێکی هەڕەمەکییە..

لەبــەر ئــەم هۆیانــە و چەنــدین هۆکــاری دیکــەش، نــاتوانن وێنای پابەنـدبوونی فەلـسەفی بکـەن، تـەنها وەک بـڕیارێکی هەڕەمەکی نەبێت، کە بە ئازادی ناوزەدی دەکەن.

ئێوە مێژووی مارکس دەشێوێنن، کاتێک دەڵێن: مـارکس پێناسی فەلسەفەکەی تەنها بە پابەندبوونی بە فەلسەفەکەیەوە لە بواری پراکتیکدا کـردووە. پابەنـدبوونی مـارکس، یـان بـە مانایـەکی دی، کاریگەرییـە کۆمەڵایـەتی و سیاسـییەکەی، بـە پێچەوانەی ئەمەوە بوو، دیاریکردنی بیرۆکەیەک بوو کە زۆر لەو بوارە فراوانتـرە. بـەڵام تیۆرییـەکانی، تـەنها لـە ڕێگـەی چەنـدین تاقیکردنـەوەوە نـەبێت، دیـاری ناکرێـت. بـە لایـەن منەوە ئاشکرایە؛ گەشەکردنی بـیری فەلـسەفی لای مـارکس، شان بـە شـانی گەشــەی سیاسـیو کۆمەڵایـەتی، هۆشـیارانە هەنگاوی ناوە.

فەلسەفە و ڕامیاری..

ئەم شان بە شانییە تا ڕادەیەکی زۆر یـان کـەم، هـەروەها لای فەیلەسوفانی پێشووش ڕوون و ئاشکرایە. ئەگەر (کانت/ **Kant**) بەو فەیلەسوفە ڕێبازگەرییە ناوبەرین، کە لـە هـەموو

کارێکی سیاسی دوورکەوتۆتەوە، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە فەلسەفەکەی هیچ ڕۆڵێکی سیاسی نەگێڕاوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، بەڵگەش بۆ ئەوە؛ (هاینێ- **Heine**) (کانت)ی بە ڕۆپسپێری ئەڵمانیا ناوزەد دەکرد. ئەگەر توانرا بڕوا بەوەش بهێنرێت کە گەشەی فەلسەفی لە سەردەمی (دیکارت)دا هیچ ڕۆڵێکی سیاسی نەدەگێڕا، بەڵام پێچەوانەی ئەمە ڕاستە، چونکە لەگەڵ دەستپێکردنی سەدەی نۆزدەدا ئەم وتەیە شتێکی نەشیاو و مەحاڵ بوو. بە شێوەیەک لە شێوەکانیش، گەڕانەوە لەم ڕۆژگارانەی ئێستامانەوە بۆ هەڵوێستی پێشووی مارکسیزم، لە گەڕانەوە بۆ سۆشیالیستی ڕادیکاڵی زیاتر چی دیکە نییە.

بوونگەرایی و شۆڕش..

بوونگەرایی، بە گوێرەی ئەو توانایەی لە ئافەریدەکردنی ویستە شۆڕشگێڕییەکاندا هەیەتی، پێویستە بەر لە هەموو شتێک ڕێگەی ڕەخنەگرتن لە خود بگرێتە بەر، بەڵێ، ڕەنگە ئەمە شتێکی خۆشەویست نەبێت (بێزراو بێت) بە لایەن بوونگەرایانەوە، بەڵام ئەرکێکە بە سەریانەوە، چونکە ئیدی زۆر پێویستە بوونگەرایی بە تەنگژەیەکدا تێپەڕێت کەوا لە دەروونی ئەو کەسانەدایە؛ بوونگەرایی لەخۆ دەگرن و بەرگری لێدەکەن، تەنگژەیەکی دیالیکتیکی کە تا ڕادەیەک

پارێزگاری لەو هەڵوێستانە دەکات، کە هەندێکیان بێبەها نین. ئەم هەوڵە ڕەخنەییە، پێدەچێت زۆر پێویست بێت، ئەگەر ڕوانیمانە دەرەنجامە کۆمەڵایەتییە کۆنەپەرستەکانی هەندێک لە بوونگەراکان پوختی دەکەنەوە. یەکێک لە بوونگەراکان، لە کۆتایی تۆژینەوەیەکی شیکاریی خۆیدا نووسیویەتی: "دیدی دیاردەیی" بە سوودە لە بواری کۆمەڵایەتی شۆڕشگێڕیدا، چونکە بە هۆی مەبەستگەری (هەست)ەوە – **intentionnalit’e** لەسەر چەشنە جیاوازەکانی، بۆرژوازە بچووکەکان فەلسەفەیەک دەکەنە چەکی دەستیان کەوا دەکات لە پێشەنگی بزوتنەوەی/ بزاوتی شۆڕشگێڕی جیهانیدا بن.

بوونگەرایی و ڕامیاری..

دەتوانم چەند نموونەیەکی دیکەشتان بۆ بهێنمەوە، کە نیشانی دەدەن؛ خەڵکانێک هەن بە کارەوە پابەندن و بە جۆرێک بە بیرۆکەی بوونگەراییەوە بەستراون، تا دەگەنە ئاستی داهێنانی تیۆرییە سیاسییەکان، ئەویش یان بە ئازادیخوازی/ لیبرالیزمی –نوێ-وە- **Neo-Libe’ralisme** یان **New Libralism** ڕەنگرێژ کراوە، یاخود بە ڕەوتی/ خواستی سۆشیالیستی ڕادیکاڵییەوە. ئەمەش مەترسییەکی جەخت کراوە. ئەوەی بە پلەی یەکەم بەلامانەوە گرنگە؛



تۆژینەوە نییە لە یەکانگیری دیالیکتیکی نێوان ئەو بوارە جیاجیایانەی کە بوونگەرایی چارەسەریان دەکات، بەڵکو گرنگ ئەوەیە؛ ڕێڕەوی ئەو بیرۆکانە ببینین، کە چۆن (بە پشت بەستن بە تۆژینەوە، ئەوجا تیۆری، پاشان هەڵوێست کەوا دەزانن هەموویان بە باشی دیاریکراون) بە ئاراستەی فەلسەفەدا دەچێت یان دەبێتە هۆی فەلسەفە، بێگومان فەلسەفەی تێڕامانیی بێدەنگ نییە و باسکردن لەم جۆرەش لە کاتی ئێستادا بێهودەییە، بەڵکو شتێکە، کە لە فەلسەفەی هەوڵدان دەچێت.

ئەوەی ئێستا باسمان کرد، پێدەچێت لەگەڵ هەندێک پابەندبوونی تاکگەراییدا ناکۆکی نەبێت، بەڵام بە ڕاستی ناکۆکی لەگەڵ تۆژینەوەکەماندا هەیە، دەربارەی ئەو پابەندبوونەی بە بەهای سەرتاپاگیری- **Collective** یان **Coliective** وەسپ دەکرێت و لە سەرووی هەموو شتێکەوە بە بەهای (یاسادانان) ناوبوێر دەکرێت، واتە بە بەهایەکی میتۆدیی. بەڵێ، ئایا ئەرکی بوونگەرا نییە ڕێنمایی دیاریکراو بە ناوی ئەو ئازادییەوە ببەخشێت کە بانگەوازی بۆ دەکات؟ ئەگەر بوونگەرایی فەلسەفەیەک بێت و بەو ئاراستەیەدا ڕێبکات کە سارتەر بۆی دیاریکردووە، ئەوا پێویستە ڕێنمایی خەڵکی بکات و بڵێت: (بۆ وێنە لەساڵی (١٩٤٥)دا، ئایا چوونە ڕیزی حزبی سۆشیالیستی یان حزبی کۆمۆنیستی یان هەر




حزبێکی دیکە، ئەرکێکی پێویستە! هەروەها پێویستە بڵێت: ئایا بوونگەرایی لە پاڵ حزبی کرێکارانە یان لە پاڵ حزبی بۆرژوازە بچووکەکاندایە!

سارتەر.. شتێکی ئاسان نییە بە شێوەیەکی تەواو وەڵامی هەموو ئەو شتانە بدەمەوە کە باستان لێوە کرد، بەڵام هەوڵ دەدەم وەڵامی هەندێک لەو خاڵانە بدەمەوە کە لەلای خۆم تۆمارم کردوون. یەکەم ئێوە هەڵوێستێکی دۆگمایی/ کوێرانە- **Dogmatique** یان **Dogmatic** وەردەگرن و دەڵێن؛ ئێمە بەرەو دواوە، بۆ هەڵوێستی پێش مارکسیزم دەگەڕێینەوە، لەو بەڵگەیەی پێویست بوو بیخەنە ڕوو، ئەویش ئەوەیە؛ ئێمە هەوڵنادەین هەڵوێستێک وەربگرین کە ئەو تێپەڕی کردووە/ تێیپەڕاندووە، لێرەدا نامەوێت ئەم خاڵە باس بکەم، بەڵام لێتان دەپرسم: ئەم چەمکەتان، دەربارەی ڕاستی، لە کوێوە هێناوە؟

مارکسیزم ڕێبازگەرییەکی وشک..

ئێوە بیر لەوە دەکەنەوە کە چەندین شتی زۆر ڕاست هەن، لەبەرئەوەی ئێوە بە ناوی باوەڕێکی دیاریکراوەوە، چەندین پرۆسەی ڕەخنەیی جیاوازتان بە ئەنجام گەیاندووە، بەڵام ئەگەر خەڵک شت- **objects** بووایە، وەکو دەڵێن، ئەوا ئەم باوەڕە لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە؟ پاشان دەڵێن؛ کاتێک



مرۆڤ مامەڵەکردنی مرۆڤ ڕەتدەکاتەوە، بەوپێیەی ئەوە شتێکە/ شتە، ئەو کارە بە ناوی ئابڕووی مرۆڤایەتییەوە دەکات. بەڵام ئەوە هەڵەیە، چونکە هۆکارەکەی، جۆرە هۆیەکی لۆژیکی و فەلسەفییە، ئەگەر تۆ جیهانی شتەکان دابنێیت، ڕاستی بزر دەبێت، چونکە جیهانی شتەکان بریتییە لە جیهانی ئەگەرەکان/ شیاوەکان، لەبەرئەوە پێویستە لەگەڵ ئێمەدا بڕوا بکەیت کە هەموو تیۆرییەک؛ زانستی بێت یاخود فەلسەفی، تیۆرییەکی ئەگەرییە/ شیاوییە، بەڵگەش بۆ ئەوە؛ بابەتە زانستی و مێژووییەکان بەردەوام دەگۆڕێن و لە شێوەی گریمانەدا دەخرێنە بەرچاومان.

ڕەخنە لە فەلسەفەی مارکسیزم..

ئەگەر گەیشتینە ئەو بڕوایەی جیهانی شتەکان، واتە جیهانی گریمانەکان تاکە جیهانێکە، ئەوا ئەو کاتە لە جیهانی شیاوەکان زیاتر، هیچی دیکەمان نابێت، وە ئەگەر لە لایەکی دیکەوە شیان/ گونجان لە خودی خۆیدا پشت بە ژمارەیەک ڕاستی دەستەبەرکراو ببەستێت، ئەوا باوەڕ لە کوێوە دێت؟

مەیلی/ ڕەوتی (خودگەرایی)مان، بوارمان پێدەدات ژمارەیەک لە ڕاستییە باوەڕپێکراوەکەمان دەستبکەوێت و، بە گەڕانەوەمان بۆیان دەتوانین بتانخەینە نێو جیهانی شیانەوە و پاساو بۆ ئەو ڕاستییە بهێنینەوە، کە لەم دواییەدا خستانەڕوو، کە شایانی تێگەیشتن نییە، بە هۆی ئەو



هەڵوێستەی وەرتانگرتووە. بەڵام ئەگەر ئێوە دەرک بە ڕاستی ناکەن؛ ئایا ئەو کاتە دەتوانین وێنای تیۆری مارکس تەنها بەو تیۆرییە نەکەین کە دەردەکەوێت و پاشان ئاوا/ بزر دەبێت و دواتر دەگۆڕێت، بە جۆرێک جگە لە بەهای تیۆرییەک، هیچی دیکەی نەبێت؟ چۆن دەتوانرێت دیالیکتیکی مێژوویی بوونیاد بنێین، ئەگەر دەست نەکەین بە دانانی ژمارەیەکی دیاریکراو لە ڕێساکان؟ ئێمە لە کۆژیتۆی- **Cogito**- (دیکارت)دا بەدی دەکەین، کە بەردەوام لە بواری خودگەراییدا هەیە.

مارکسیزم و بوونگەرایی..

ئێمە هەرگیز باسمان لە بوونی مرۆڤ نەکردووە، کە بە لایەن مرۆڤەوە بابەتێک بێت، بەڵام لەو بڕوایەداین کە؛ پێویستە خودگەرایی مرۆیی هەبێت خۆی بخاتە ژێر باس بەو پێیەی کە خودە، تاوەکو دواتر بتوانێت بابەت بخاتە ژێر باس و خواسەوە بەوپێیەی کە بابەتێکە.

لە لایەکی دیکەوە، باس لە دۆخی مرۆڤ دەکەیت و پێی دەڵێیت: پڕۆژەی پۆزێتیڤیزم/ بارودۆخ، لە هەمان کاتدا باس لە دیاریکردنێک بۆ مرۆڤ دەکەیت، بەو پێیەی کە تەنها پڕۆژەی دیاریکردنە- **pre’de’termination**، ئەگەرچی ئاگاداری ئەوە نەبوویت کە ئێمە بڕوا بە زۆربەی شرۆڤە مارکسیزمییەکان دەکەین و، تۆ ناتوانیت ڕەخنەمان لێبگریت،



وەک چۆن ڕەخنە لە بیریارانی سەدەی هەژدەیەم دەگریت، کە ئەوان سەرجەمی مەسەلەکەیان نەزانیوە. هەرچی ئەوەی لە بارەی دیاریکردنەوە پێت ڕاگەیاندین، ئەوا لە مێژە دەیزانین و، گرفتی ڕاستەقینە بەلای ئێمەوە؛ لە گرفتی پێناسکردنی مەرجە گەردوونییەکان زیاتر بەدەر نییە.

بە بۆچوونی ئێمە، سروشتی مرۆیی بوونی نییە، بۆیە بە لامانەوە گرنگە لەنێو مێژوویەکی بەردەوام گۆڕڕاودا، پارێزگاری لە ژمارەیەکی باشی پرەنسیبە گەردوونییەکان بکەین، کە بوارمان پێدەدات هەر ڕووداوێکی مێژوویی لێک بدەینەوە، بێگومان ئەمەش تێگەیشتنێکی باشی سەردەمەکەت بەسەردا دەسەپێنێت، کە ئەو ڕووداوە مێژووییەی تیادا بە ئەنجام گەیەنراوە. بەمجۆرە ئێمە کۆکین لە وتنی ئەوەی سروشتی مرۆیی بوونی نییە، ئەمەش مانای ئەوە دەبەخشێت؛ هەموو سەردەمێک یاسای دیالیکتیکی خۆی هەیە، کە بە گوێرەی ئەو یاسایانە گەشە دەکات و، مرۆڤیش بەستراوەتەوە نەک بە سروشتی مرۆییەوە، بەڵکو بەو سەردەمەی کە تیایدا دەژی.

ناڤیل: هۆکارگەری لە مێژوودا..

کاتێک ئێوە هەوڵ دەدەن ڕووداوێکی مێژوویی ڕاڤە بکەن، کە لە سەردەمێکی دیاریکراودا ڕوویداوە، دەڵێن: "ئەمە و ئەوە.. لەبەرئەوەی ئێمە بۆ بارودۆخێکی دیاریکراو



دەگەڕێینەوە"، بەلاَم ئێمەی مارکسی، بۆ لێکچووەکان یان بۆ ئەو جیاوازییانە دەگەڕێینەوە کە لە نێوان ژیانی کۆمەلاَیەتی ئەو کاتەو ژیانی کۆمەلاَیەتی ئێستادا هەیە. ئەگەر پەنامان بردە بەر شیکردنەوەی ئەو لێکچوونییە سەبارەت بە نموونەیەکی پوختەوە، ئەوا ئێمە ناگەینە هیچ شتێک. بۆ نموونە؛ گریمان، ئەگەر فەیلەسوفەکان پاش دوو هەزار سالَی دیکە ویستیان ئەم سەردەمەی ئێستامان شی بکەنەوە و، بێجگە لەو بابەتە جیاوازانەی دەربارەی دۆخی مرۆڤ هەن، چی دیکەیان لەبەر دەستدا نییە، کەواتە ئەوان بۆ ئەنجامدانی شیکردنەوەیەکی پێویست، لە کاتی گەڕانەوەیاندا بۆ ڕابردوو چی دەکەن بەچی؟ ئەوان ناگەنە هیچ شتێک.

سارتەر: ئێمە هەرگیز بیرمان لەوە نەکردۆتەوە کە ئەرکی ئێمە نییە بارودۆخە مرۆییەکان، یان مەبەست و ئامانجە تاکە کەسییەکان شی بکەینەوە. ئەوەش کە پێی دەلَێیت: دۆخی مرۆڤ، بە تەواوی لە سەرتاپای مەرجە مادی و دەروونییە قولَەکان زیاتر چی دیکە نییە، کە لە سەردەمێکی دیاریکراودا پێناسی هەر کۆمەلَێک دەکات.

ناڤیل: هۆکارگەری..

پێم وانییە پێناسینەکانتان لە دەقەکانتان بچن، لەگەلَ ئەوەشدا، لە وێناکردنی ئێوەدا بۆ دۆخی مرۆڤ، وا دەردەکەوێت کە لە تواناادا نییە، لەگەلَ چەمکی مارکسیدا



بــەراورد بکرێــت، ئەگــەر لــە دەرەوەش بێــت، ئــەوەش لەبەرئەوەی ئێوە نکوڵی لە هەموو مـەیلێک/ ڕەوتێـک بـەرەو هۆکارگـەری دەکـەن. پێناســەکەتان پێناسـەیەکی دەقـاودەق نییە، بەڵکو هەندێک جـار بـە لێهاتوویـیـەوە لـە خاڵـێکەوە بـۆ خاڵێکی دی دەخلیسکێت، بەبێ ئەوەی بە شـێوەیەکی ڕێـک و تەواو دیارییـان بکـات. بـەڵام سـەبارەت بـە ئێمـە بـارودۆخ/ پۆزێتیڤیزم بریتییە لە کۆمەڵـێکی دیـار و دەرکـەوتوو کـە بـە زنجیرەیــەک لــە دیــاریکردن و لــە شــێوەی هۆکارێکــدا دەردەکەوێت، هەروەها هۆکارگەری نموونە ئامارەییـەکانیش لەخۆدەگرێت.

سارتەر.. ڕەخنەی هۆکارگەریی مارکسیزم..

تۆ بـاس لـە هۆکارگـەری دەکـەیت، لـە جـۆری ئامـارەیی، ئەمەش لە بڕوای مندا هیچ شتێکی ئەوتۆ ناگەیەنێت. دەکرێـت بــە شــێوەیەکی ورد بــۆم دیــاری بکــەیت مەبەســتت لــە هۆکارگەری چییـە؟ باوەڕبکـە، مـن بـڕوا بـەو هۆکارگەرییـە مارکسییە دێنم، کە ڕۆژێک یەکێک لە مارکسیزمەکان بۆم شی دەکاتەوە. بەڵام ئێوە، کاتێک باسی ئازادیتان بۆ دەکەن، کاتی خۆتــان بــەو وتەیــە بــە فیــڕۆ دەدەن، کــە دەڵــێن: ببــورە هۆکارگەریتان لەبیرچوو، پاشان لـە لایـەکی دیکـەوە نـاتوانن ئەو هۆکارگەرییە شـاراوەیە شـیبکەنەوە، کـە هـیچ مانایـەکی

نییە، تەنها لای هیگڵ- **Hegel** نەبێت، کەواتە شتێکی ئاشکرایە کە وێناکردنی ئێوە دەربارەی هۆکارگەری، تەنها خەونێکی مارکسییە.

ناڤیل.. ڕاستیی زانستی..

دەمەوێت ئەوە بزانم؛ ئایا بڕوا بە بوونی ڕاستیی زانستی دەکەن؟ چونکە چەندین بوار هەن کە هیچ جۆرە ڕاستییەک لەخۆناگرن، بەڵام جیهانی شتەکان- هیوادارم بڕوا بەوەش بکەن- ئەو جیهانەیە کە زانستەکان بایەخی پێدەدەن و خاوەنی ڕاستیی بابەتییە. بەڵام بە لایەن ئێوەوە تەنها جیهان شیاوییە/ ئەگەرییە و ناگاتە ڕاستی، واتە؛ تەنها بڕوا بە بوونی ڕاستیی ڕێژەیی ناکات. کەواتە ئایا بە لایەنی کەمەوە بڕوا بەوە ناکەن کە ئەو زانستانە چەمکی هۆکارگەری بەکاردەهێنن؟

سارتەر: نەخێر، هەرگیز بڕوامان بەوە نییە، چونکە زانستە پوختەکان، ئەبستراکتەکان لە هۆکارگەری واقیعی ناتۆژنەوە، بەڵکو لە گۆڕانی توخمەکان دەتۆژنەوە، کە ئەویش هەر پوختە/ ئەبستراکتە. لێرەدا ئێمە لە بەردەم توخمە گەردوونییەکاندایین، کە لەسەر ئاستێک هەن، دەتوانین تیایدا لە پەیوەندییەکانی نێوان ئەو توخمانە خۆیاندا بتۆژینەوە، بەڵام ئەوەی لە مارکسیزمدا ڕوودەدات؛ تۆژینەوەی یەک

کۆمەڵـــەیە و تیایـــدا بـــە دوای هۆکارگەرییەکـــدا دەگـــەڕێت، هۆکارگەرییەک، کە هەرگیز وەک هۆکارگەریی زانستی نییە.

ناڤـیل: ئێـوە نموونەیـەکی شـیکراوەتان بـە درێـژی بـۆ هێنایەوە، ئـەویش نموونـەی ئـەو لاوەیـە کـە بـە مەبەسـتی ڕاوێژپێکردن هاتە لاتان.

سارتەر: ئایا ئەو لاوە لە ئاستێکی ئازادیدا نەبوو؟

ناڤیل: بەڵام پێویست بوو وەڵامی پرسیارەکەی بدەیتـەوە، ئەگەر من لە جێگەی تۆ دەبووم، هەوڵم دەدا بـزانم ئـەو لاوە دەتوانێت چی بکات؟ یان بۆ نموونە بـزانم تەمـەنی چەنـدە و باری مـادیی و پەیوەندییـەکانی لەگـەڵ دایکیـدا چۆنـە! بەڵـی ئەوکاتە بیروڕاکەم، بیروڕایەکی شیاو/ گونجاو دەبوو، بـەڵام هەوڵـم دەدا هەڵوێـستێکی ڕێـک دیـاری بکـەم، هەڵوێـستێک، ڕەنگە لە بواری کـاردا چـەوت دەربکـەوێت، بـەڵام بەوپـەڕی دڵنیاییەوە بانگەوازی ئەو لاوەم دەکرد پابەند بێت و کـارێکی ئەوتۆش بکات.

سارتەر: بەڵام ئەگەر ئـەو لاوە بـۆ ڕاوێژکـردن بهاتایەتـە لای تـۆ، ئـەوا ئـەو هـەر بـە ئەنجامـدانی ئـەو هـەنگاوە، وەڵامەکەی هەڵدەبژارد. دەمتوانی بە هەر شێوەیەک بێت بـە کردەوە پراکتیکییەوە ئامۆژگاری بکەم، بەڵام ئـەوەم نـەکرد، بەڵکو ویستم ئەو بۆ خۆی بڕیاربدات، چونکە ئـەو دەیویـست

ئازاد بێت، من دەمزانی ئەو لاوە چی دەکات، بە ڕاستیش، چۆن وێنام دەکرد، ئەو لاوە هەر بەو جۆرە ڕەفتاری نواند.

١٩٥٤/٣/١٦

سەرچاوە:

**الوجودية فلسفة انسانية**

**تأليف/ جان بول سارتر**

**ترجمة/ حنا دميان**

**دار بيروت للطباعة والنشر/** ١٩٥٤

تێبینی:

وەرگێڕی عەرەبی (حەنا دومیان) ئەم بابەتەی لەژێر دوو ناونیشاندا وەرگێڕاوە، یەکەمیان (بوونگەرایی فەلسەفەی مرۆڤایەتییە)، دووەمیان (بوونگەرایی ڕێبازی مرۆڤایەتییە) بەڵام ناواخن هەریەک بابەتە، بە یەک شێوەی وەرگێڕان.

سەرنج:

بە پێی توانا هەوڵمداوە ئەو زاراوە/ چەمکە هزریو فەلسەفییانەی کە لە دەقە عەرەبییەکەدا تەنها بە فەڕەنسی بوون، کەم تا زۆر بەرامبەریان زاراوەکە بە زمانی ئینگلیزیش دابنێم، بۆ ئەوەش پشتم بە فەرهەنگی زمانەوانی و فەلسەفی بەستووە.

وەرگێڕی کوردی/ ڕۆشنا



ناواخن



---

[1] هەروەها چەمکێکی دیکەش بۆ هیومانیزم هەیە کە تیایدا خودا لە ڕێنماییکردنی چارەنووسی مرۆڤایەتی و سەقامگیرکردنیدا بەشداری دەکات. (و.ع).




[2] کۆژیتۆ- Cogito، بە لاتینی مانای (مـن بیردەکەمـەوە) دەبەخشێت، هەروەک دیکـارت وتوویـە: (مـن بیردەکەمـەوە، کەوابێت من هەم)، کۆژیتۆش بە مانای ئـەم وتەیـەی دیکـارت دێت. (و.ع).

[3] البدعة/ بە مانای شتی تازە، دروسـتکراو، تـازە داهـاتوو، نوخشە، نۆبەرە، هەڵبەستراو دێت (و.ک).

[4] (ماهیة) کـە چـەمکێکی فەلـسەفییە، مانایـەکی فـراوان دەبەخشێت، ئێمە بەم دوو واتایـە کردوومانەتـە کـوردی: ١- Essence: کرۆک، جەوهەر، بنەڕەت، ناخ. ٢-چییەتی (و.ک).

[5] وتنی ئەوەی ئێمە ناتوانین شەڕ هەڵبژێرین دەگەڕێتەوە بۆ تیۆری خودگەرایی لـە بـەهادا، کـە دان بـە بـوونی خێـر و شـەڕدا ناهێنێت وەک بوونێکی واقیعی لـە دەرەوەی ئـاوەزی (ئەقڵی) مـرۆڤ، واتـە: نـە لـە (ئـاوەزی کۆمەڵـگەدا) و نـە لـە (ئاوەزی خودا-دا)، بەڵام تیـۆری بابەتگـەری لـە بـەهادا، لـەو بڕوایەدایە کە ئێمە بڵێین: ئازادی ناتوانێـت شــەڕ هەڵـبژێرێت، ئەمە شێواندنی واتـای ئـازادی دەگەیـەنێت، چونکـە چـەمکی شەڕ بابەتییە (و.ع).

[6] مەبەسـت لــە کــردەی خــۆڕایی لای جیــد ئەوەیــە؛ کردەیەکی تەواو هەڕەمەکی بێت، واتە بێئەوەی پابەندی هـیچ مەرجێک بێت، یـان پێـشتر ئاراسـتەی ئامـانجێکی دیـاریکراو بکرێتەوە (و.ع).



[7] ترانسێندێنتاڵ- transcendance یان transcendental لای سارتەر، مانای تێپەڕاندنی خود بـەرەو جیهـانی دەرەوە بەرەو ئەوی دیکە دەبەخشێت، ئەوەش تـەنها تێپەڕاندنـە و چ کاریگەرییەکی شتێکی ئەوتۆی ئاسمانی تێدانییە (و.ع).